# قاوەکان خراپ سەفەر دەکەن

پەری کەریمی نیا










# قاوەکان خراپ سەفەر دەکەن

پەری کەریمی نیا




لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی
ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرەی کتێب **٥٩**

# قاوەکان خراپ سەفەر دەکەن

چیرۆک

## پەری کەریمی نیا

- بەرگ: فەهیمە کەریمی
- نەخشەسازیی ناوەوە: سینا حەکیمزادە
- چاپ: یەکەم- ٢٠١٥
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٣٠٠٠ دینار
- بڵاوکار: ناوەندی غەزەلنووس- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ١١٤٣ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە

## (...)

بیری خــوا تورومپاکەی دەمێکە بــوو ئاوەکەی چــووبووە خوارێ.

هەتاو هەرچی تیشکی هەبوو ناردیە ئێرە. خەڵک عەجمانیان لێ هەڵگیرا. بووکەبارانەیان ساز کرد و خنکانیان لە ئاوا. ئینجا دەستیان هەڵخست: خوایە بیکە بە خاتر خۆشەویستی پێغەمبەرت باران دابارێنە. با گیاوگژ شین بنۆ. مەڕ و بزن لی بخۆن. شیر بەن و ماڵو منالّمان لی تێربن و گەورەبن و ببنە ساحێو ماڵو منالّو لە ئێمەیش رازی بیت.

خوا وتی: باشە هەندێ ئاوم دەنێ با بیرەکەی پێ‌بێنمە سەر.

کە هەموویان چاویان لە ماڵەکانیان کرد بەقەدەر خواردنەوەی خۆیان ئاویان بووو بەس.

## (بۆن)

حەزم چووەتە پیاوێک، ماچەکانی بۆنی ئۆدکۆلۆن ئەدات. کە دەم ئەنێتە سەر دەمم سەرەتا دەمم دوای بازنەیەکی دەوری دەمم ئەوجا هەموو کەشەکە پڕ ئەکا لەبۆنی ئۆدکۆلۆن. وێنەگرەکە وێنەیەکی لێگرتین. ئەورۆ وێنەکە دەگاتەوە دەستم.

لە ئەشپەزخانە دانیشتووە و گۆشت ورد دەکات. لەدەرکە درا.

- ئای وێنەکەم هاتییەوە؟

بە پەلە هەستا. دەرکەکەی کردەوە. پاکەتەکەی وەرگرت. هەڵی پچڕی. وێنەکەی دەرهێناو بردی بۆ لێوەکانی.

- ئەی بۆ ئۆدکۆلۆنەکەی کوا؟

چووە ئەودیو درگاکەوە، هەڵات بە دوای وێنەگرەکەداو وێنەکەی دایەوە.

# (مان)

حەوتووی جارێ دەچووە سەر قەبرەکەی‌و بنە هەڵاڵە برایمەکە کە خۆی چاندبووی، ئاوی دەدا. زرەی تەلەفۆنەکە لە بیری خست.

- وەڵامەکەت بوو بەچی؟

- من ژیانم وا بە ئاسانی نەگرتووە دەبێ قسەی لەسەر بکرێ.

- دەی باشە با لە ..... یەک ببینین.

تەلەفۆنەکەی دانا. جلەکانی لە سنگەکە کردەوە. قەڵەم چاوەکەی لە کومیدی جلەکان دەرهێناو چووە بەر ئاوێنەکە. جلەکانی لەبەر کردو قەڵەمێکی بە چاویا هێنا. رۆژمێرەکە کێشای بۆ لای خۆی. چاوی لێ کرد تا ئەم رۆژەی هەر لەیاد بمێنێ (هەینی). لچێکی هەڵقورتاندو چووەوە بەر ئاوێنەکە. قەڵەمەکەی هەڵگرتەوە خاڵێک لە پەنای خاڵەکەی‌تری ناوچاوی بکوتێ. تەقەی دەرکە هەستا. کردیەوە. چەپکێ

هەلالەبرایمە لەبەر دەرکە راکیشرابوو. بە پەلە هەلیگرتەوە. دەرکەی لە خۆی داخست. قەلەمەکەی دووکوت کرد.

# (٢)

حەوتووی جارێ دەچوومە سەر قەبرەکەی و بنەهەڵاڵەبرایمەکە کە خۆم چاندبووم، ئاوم دەدا.

زڕەی تەلەفۆنەکە لە بیرمی خست.

- وەڵامەکەت بوو بە چی؟

- من ژیانم وا بە ئاسانی نەگرتووە دەبێ قسەی لەسەر بکرێ.

- دەی باشە با لە ..... یەک ببینین.

تەلەفۆنەکەم دانا. جلەکانم لە سنگەکە کردەوە. قەڵەم چاوەکەم لە کومێدەکە دەرهێناو چوومە بەر ئاوێنەکە. جلەکانم لەبەر کردو قەڵەمێکم بە چاوما هێنا. ڕۆژژمێرەکە کێشامی بۆ لای خۆی. چاوم لێکرد تا ئەمرۆژەم هەر لەیاد بمێنێ (هەینی). لچێکم هەڵقورتاندو چوومەوە بەر ئاوێنەکە. قەڵەمەکەم هەڵگرتەوە.خاڵێک لەپەنای خاڵەکەی‌تری ناوچاوما بکوتم. تەقەی دەرکە هەستا. کردمەوە. چەپکێ هەڵاڵە برایمە لەبەر دەرکە

راکێشرابوو. بە پەلە هەڵمگرتەوە. پەرداخێ ئاوم هێناو هەلالەبرایمەکەم تێخست و نامە بەر خۆرەکە. گەڕامەوە بەر ئاوێنەکە. خاڵەکەم کوتاو جانتاکەم هەڵگرت و دەرکەکەم لەو دیوەوە پێوەدا.

# ( گەڕەکەکەی خۆم )

داوەڵ ...م بە دەستەوەیە. کارییەکەمم نیە پێشتر داوەڵ عەباس، داوەڵ رەحیم، داوەڵ مەنسوورو داوەڵ عەلیشم دروست کردووە. ئەو دوانەییەکەمیانم هەر لەبەر دڵان نییە لە گەڵاڕێزاندا سازم کردوون. من خواییەکەی خۆشم لەزەردی هەر نەهاتووەو بە هاتنیشی هەرچی ئازامە دادەهێزرێ. بەڵام دوو داوەڵەکەی دی رۆح و رەوانمن. داوەڵ مەنسوور هێن بەهارە. ئەمن پێم وایە بەردە بناخەی زەوی وەستا کەریم لەم رۆژەدا دایناوە. داوەڵ عەلیش هەرچەند چلەی زستانییەو هەر بە ناو هێنانی زستانیش سڕی دامدەپۆشێ کەچی هەر بە راددەی سپیایی چاوم دەمەوێ. راستی مردوو بێکفن دەبێ؟ بۆیە بۆ ئەم چوار داوەڵەم کۆڵانێکی دوورو درێژم ساز کرد و پلاکێکی شینیشم لەسەرەتای کۆڵانەکەدا داکوتیو

لەسەرم نووسی: کۆلانی داوەڵە.... نا جارێ ناوێکم بۆ هەڵنەهێناوە.

بەتەمام کە ئەم داوەڵەیشم تەواو کرد ئەویش کەمە خەڵکی ئەم کۆلانە. ئەمانە لەژێر خانەکەماندا درووست دەکەم ژێرخانێکی تاریکی زەبەلاح. باوکم بە هیچ جۆرێ بە بوونی ئەم داوەلانەی نەزانیوە. بۆیە لەهەرکوێش دادەنیشێ با دەکاتە خۆی: (ئەم کچەم خوارەحمی کرد لە کچی کەس ناچێ. داوەڵ ساز؟ هەر باسی مەکە بەلام بەو خوایە هەرسووسە بکەم بزانم داوەڵ ساز دەکایا نا کردوویە دەیبەم لای پردی گەورە بەدەستی خۆی قەبرێکی پێ هەڵدەکەنم. لە چاڵی دەخەم) بۆیە منیش دایکم کردووە بەچرا رێنوێنی سەرکۆلان. هەر کە باوکم دەرکەوت چرایەکی سووری پێیەپەیتا پەیتا هەڵیدەکاو دەیکوژێنێتەوە. ئیتر منیش بەپەلەپارچەیەکی زەلام دەکێشم بەسەر کۆلانەکەدا. خۆم دەکەم بە خەو.

چرا هەڵنییە دانیشتووم خەریکی سازکردنی دڵی داوەڵ...م.

- ئەرێ بەهیوابە خێرت بۆ دەداتەوە! ( داوەڵ عەباس)

ـ من به تیشکی چاوم ناهێڵم دڵی بگەشێتەوە!( داوەل مەنسوور.)

لەتێکی دڵی لە دەستم کەوتە خوارێ. هەڵمگرتەوە.

ـ جا کاری بە زۆری چۆن دەبێ! ( داوەل رەحیم.)

توند سفتم کردەپاڵیەک.

ـ سەیرکە کە منت دروست کردووە، ئایا دەبێ دەست بە درووست کردنی یەکێکی دیش بکەی؟ من ئیزنی کاری وا نادەم. (داوەل عەلی)

ـ رۆڵە خەریکی کاری خۆت ببە. ئەگەر ئەوان راستیان بکردبایە بۆ داوەل نەبوونی خۆیان کارێکیان دەکرد.

دەست لەپارچەکانی دڵی داوەل... دەساوم.

ـ من کە وتم دەبێ لەگەل بنەماڵەکەیاندا هەر تێکەڵاویم هەبێ. (داوەل رەحیم).

ـ هەڵبەت ئەگەر رادەوەستێ تا بارودۆخەکەم خۆش دەبێ ئەوە باشە، دەنا هەر وەک پێشم وتووە ئەو هەمیشە ئازادە بۆ هەڵبژاردنێکی دیکە. (داوەل عەلی)

ـ ئەمە نا یەکی‌دی (داوەل عەباس).

- من نایشیهێنم بەڵام هەر دەبێ رایشی وەستێنم. (داوەڵ مەنسوور).

دایکم چرای سوور لێدەدا. من خەوتووم. بە لای کۆڵانەکەدا تێپەڕی. ئەمجاریش هیچ.

- ترسەنۆک. من لەگەڵت بم ترست نامێنێ! (داوەڵ مەنسوور)

- نا پێم خۆش نییە هیچ شتێک بە دزییەوە بکەی. (داوەڵ عەلی)

- چییە بۆ خۆیان نەیانکردووە؟ (داوەڵ عەباس).

- پێم خۆش نییە هیچ شتێک لەم بارەوە بڵێم. (داوەڵ رەحیم).

لەخەو هەستاوم. ئاو لە چوار پارچە دڵەکە دەپژێنم. ئەملاو لاکانی رێک دەکەم. هەر چوارەکەیان دەنێم بەیەکەوە.

... (داوەڵ عەباس تیشک دێنێ دەیکاتە چاوییەوە.)

... (داوەڵ مەنسوور تکتک ئاو دەکات بەدەم خۆیەوە.)

... (داوەڵ رەحیم بەدوای کەسێک لەناو بنەماڵەکەماندا دەگەڕێ.)

... (داوەڵ عەلی گۆرانییەکانی داریووش دەڵێتەوە.)

دڵەکە دەستی لێبەردەدەم هەر چوارپارچەکە چەسپیون بەیەکەوە.

داوەڵ عەباس:... (زوو دەچێت ژیانێکی هاوبەش پێکدێنێت.)

داوەڵ مەنسوور:... (بڕیاری داوە هەم خۆی‌و هەم من بکوژێ.)

داوەڵ عەلی:... (پوولەکانی لە ژوورەکەیدا خڕ کردۆتەوە بە دوای قاچاخچییەکدا وێڵە لەکۆڵانی داوەڵە... بیپەڕێنێتەوە.)

دڵی داوەڵ... لە لای چەپی دانا. ئێستاش نازانم ناوی کۆڵانەکە چی لێ بکەم.

# (بڕا)

جغارەی تیر[1]سەری بۆ ئازادی هەڵخستو وتی: دنیا زۆر خۆشە لای تۆیش وانییە؟

ئازادی سەری حەوادا، ئاسمان رەش داگیرسابوو.

جغارەی بۆن بە تیری وت: دنیا زۆر خۆشە لای تۆیش وانییە؟

تیر سەری حەوا دا ئاسمان رەش داگیرسابوو.

مارلبرۆ بە بۆنی وت: دنیا زۆر خۆشە تۆیش پێت وانییە؟

بۆن سەری هەڵخست ئاسمان رەش داگیرسابوو.

وینستۆنی هەندەرانی بە مارلبرۆێ وت:....

---

[1] تێبینی:

*نرخی جغارەکان لە کەمەوە بۆ زۆر چووە.

* جغارەی ئازادی ئێستا دروست ناکرێ.

# (پیاوەکەی سیانی کووشت)

دیمەنی (١) ئەسپە هەستایە سەر هەر دوو پێ. حیلانی. سێ پڵنگ لەدەوروبەریدا راکێشرابوون. لە حیلە کەوت. بۆچرکەیەک بەسەر هەر سێ پڵنگەوە وەستا. بەرەو شاخ سەرکەوت. بەرد خۆیان رژانە خوارەوە.

دیمەنی (٢). رووی لەبراکەی کردو وتی: نا.

دیمەنی (٣). بە پێی هەواڵێک کە دراوسێکان دەیڵێن: گوایە کۆتر خۆی حەب خواردکردووە.

دیمەنی(٤). دایکی کاغەزێکی بەدەستەوەیە ناوی ئەسپەکەو دەزگیرانەکەی تێدا دەنووسێ و بە دەرزی بەرۆک لەژێر چارەکەکەی دەدا.

دیمەنی (٥) هەواڵی دەزگیرانەکەی لەو کاتەوەی رۆیی بوو نەیدەزانی. بەلام دەزگیرانەکەی بە قاچاخی هەواڵی لە هاوالەکانی دەپرسی.

دیمەنی (٦). من لە ژیانی ئێرەکانە وەرەسم بێژ دەکەم. ئەمانە بەس منیان بۆ دۆشین دەوێ دەرۆم بۆ ئەوەی دەست بە دۆشینی خۆیان بکەن.

دیمەنی (٧). دایکی و دوو خوشکەکەی وێنەکەیان لە قاپ گرت و دانیشتن وەی رۆ وەیرۆیان بەسەردا گێڕا.

دیمەنی (٨). تەلەفۆنەکە زەنگی خوارد.

- بەڵێ فەرموون.

- ...

- بۆ لاڵ بووی

- ...

دیمەنی(٩). دەزانی بەتەمام تەختێک بهێنمەوە کەبووین بەیەک خەوتنی سەرتەخت کەیفێکی هەیە. کەیفیش لەگەڵ کێدا: کۆتر... .

دیمەنی (١٠). براکەی دەزگیرانێکی بۆ دۆزییەوە. وێنەکەی نیشانی ئەسپە دا.

- ئەم مانگایە.

دیمەنی (١١). ناوەکەت. ناوەکەت چەند خۆشە: کۆتر. دەزانی دوو کۆتر لەسەر گوێسەوانی پەنجەرەکەمدا هێلانەیان کردووە هێلکەیەکیشیان هەیە. بەمە تۆم دێتەوەیاد.

دیمەنی (١٢). کۆتر دواخەڵاتی دایێ. ئەنگوستیلەیەک و زریزەیەک.

دیمەنی (١٣). گەیشتەسەر ترۆپکی شاخەکە. لەگەڵ قاچاخچییەکە بڕێ چپەچپیان کرد. ئەم جانتاکەی دانا. وێنەکەی گیرفانی دەرهێنا.

- کۆتر:.... .

خستیە بنبنی ساکەکەو لەسەر پشت لێی درێژ بوو.

دیمەنی (١٤). هەرچی دارایی بوو دابەشی کرد بەسەر مێیینەکانی ماڵەوەدا. بۆ کۆتر فلسێکیش.

- دارایی کۆتر منم.

دیمەنی (١٥). لەسەر شاخ بێخەم لێی راکشاوە. مایینێک خۆی پێوە نووساند.

دیمەنی (١٦). کۆتر پێکەنینەکانی بایکۆت کرد.

- بەس بۆ ئەسب

ئەزانی پێکەنینەکەت زۆر خۆشە کێشانەوەکەی ئاخری پشت دەشکێنێ.( ئەسب وتی)

دیمەنی (١٧). ئاسمان شین شین. دارەکان خۆیان دەلەنگێنن. قاچاخچییەکە لەگەڵ ئەسب قسە دەکا.

ئەسب توورەیەیاڵەکەی بادەدا.

- کە ناوێری بۆ هاتی؟

- شەوێکی دی.

بە پەشۆکاوی کاتێ دەمووچاوی شەڵغانی ئارەقە بوو.. لە خەو راپەڕی. دەلەرزی، ئاوڕێکی دایەوە مایین وەستابوو.

دیمەنی (١٨). ئەلۆ... ئەلۆ... بەرزتر. تمشاکە. بە کۆتر بڵێ سلامەتم. ئەلۆ... ئەلۆ... بەختیار. ئەلۆ ئەشا ئەو شانسە کارتەکەیشم تەواو بوو.

دیمەنی (١٩). کۆتر گشت رۆژێ وێنەی ئەسپی ماچ باران دەکرد.

دیمەنی (٢٠). ئەسب خەو بە کۆتریشەوە نابینێ.

دیمەنی (٢١). بنەماڵەی ئەسب ئەمە ئەزانن کە ئەسب لە کۆتر جوێ بوەتەوە. لەسەر شتی هیچ. بۆیە دایکی ئەسب لە میوانییەکاندا بەدوای کچێکی کەڵەگەتی سپیکەلانەدا دەگەڕا.

دیمەنی (٢٢). کۆتر هەر بەتەمایە تەلەفۆنێ بۆ بەختیار بکا بەڵام تا ئێستا قسمەت نەبووە.

دیمەنی (٢٣). ئەسب دووهەم جاریش هەر خەوی دی نەڕۆی.

دیمەنی (٢٤). ئەسب هەر دوای ئەوەی کلکەوانەکەی لە کۆتر وەرگرت کلکەوانەکەی گۆڕایەوە.

- گەورەیە.

کلکەوانەکەی کۆتر بەس سەنگێکی بەسەرەوە بوو ئەوەی ئێستا شەش سەنگی هەبوو زریزەیش کە هەر نەبینرا.

- پیاوو زریزە!؟

دیمەنی (٢٥). کۆتر لە جلی رەشدا ئەگەر گوڵەکانی جلە نەبوایە لێک جوێ نەدەکرانەوە.

دیمەنی (٢٦). خۆی دەڵێ: مەیانم بە مایین نەدا. بەڵام کۆتر لە بای شەماڵی بیستبووەوە کە: دیاریشیان گۆڕاوەتەوە.

دیمەنی (٢٧). هەڵبەت تۆفیر ناکات بۆ ئێمە ژنەکەی کێ بێت. بەڵام بێجگە لە پێوەرەکانی خۆی ئێمە ژنێکی تەڕو تەمیس‌و گورجمان دەوێیەکێکمان ناوێ هەر قسەی بێ. بەرەحمەت بێ باوکیشی حەزی زۆر لە زەماوەندی ئەسب بوو بەڵام... .

دیمەنی (٢٨). ئەسب لەناو بەفردا بخەوتایە ون دەبوو.

دیمەنی (٢٩). کۆتر دوای گەڕانەوەی ئەسب خۆی دا بەدەست قەڵەمی وێنەکێشێکەوە. بیکێشێتەوە.

دیمەنی (٣٠). زەماوەندی ئەسب کەس نایبینێ.

دیمەنی (٣١). کۆترەکان لەوێ ڕۆیشتوون.

دیمەنی (٣٢). سێهەمشەویش نەڕۆییەکسەر گەڕایەوە بۆ خوار شاخ.

دیمەنی (٣٣). ئەودیو شاخ ژیانێکی خۆشە هەرچییەک بکەی هەر خۆتی و خۆت. یەکەم کارم کە گەیشتمە ئەوێ کۆتر ئەزانی چییە.

- ها

- خواردنەوە و ڕشانەوە.

- ...

- دوای دەرپێ قوتە لە پێکردن.

- ئەی من؟

- با بزانم بۆم جۆردەبێ. هەر لە بیرتام.

دیمەنی (٣٤). کۆتر کلکەوانە دیارییەکەی خستەوە ناو قوتووەکەی.

دیمەنی (٣٥). کەس بەهاتنەوەی ئەسپی نەزانی بەرەو پیری بچێ.

دیمەنی (٣٦). کۆتر دڵی ڕەزای نەدا کلکەوانەی وێنەکێش لەقامک بکات.

دیمەنی (٣٧). ئەسب کە هاتەوە کشەی لە هەرچی کۆترە کرد.

دیمەنی (٣٨). ئەسب نامەیەکی بۆ شاخ بەقاچاخی نارد. داوای سیاوشی کردەوە.

دیمەنی (٣٩). کەس لێی نەپرسی بۆچ دەچی؟

دیمەنی (٤٠). یەکەم ژەم هیچ دووهەم هیچ، سێهەم ژەم دای لە قوڵپی گریان. نەیهێشت کەس نان بخوا.

دیمەنی (٤١). هیچ رۆژنامەیەک هەواڵێکی کۆتری پێنەبوو. روژێ ماهوارە ژنێکی پیشاندا. باسی سێوەکە بوو.

دیمەنی (٤٢). خۆزگە بەقسەی خەوەکەی سەرەتام بکردایە.

دیمەنی (٤٣). کە سیاوش هەواڵی هات ئەسب لە حەمام بوو.

دیمەنی (٤٤). باوکی ئەسب چووە خەوی دایکی ئەسب پی وت: سیاوش گەورە کەن کارتان بە حەڵاڵی و حەرامی نەبێ قسمەتی ئەو ئەوەیە بە هەتیوی بەخێو دەبێ.

دیمەنی (٤٥). رۆژنامەیەکی ناوچەیی نووسی. کۆترێکی بێناوونیشان لە ژوورەکەیدا بە هەڵواسراوی دۆزرایەوە ژنانی بەر دەرگا ئەیانوت: تێکەڵاوی لەگەڵ وێنەکێش سکی پێ پڕ کرد.

دیمەنی (٤٦). باوکی سیاوش لە حەمام سیاوشی هەر نەناسیەوە.

دیمەنی (٤٧). ئەسب لە هەواڵی کۆتر ڕاچڵەکی. چاوێکی لە هەموو دیمەنەکانی ژیانی کرد.

- من کەی ئەمانەم کردووە هیچیانم لەیاد نییە؟

دیمەنی (٤٨) سیاوش لەشەقامەکاندا وێڵە.

دیمەنی (٤٩)

- .... (چەند کات بە دەنگی).

# (نەبووراوەکان)

بە مێردەکەمم وت: چوومە ناوەوە، ئاگایەکت لی بێت.

دەرکەکەی ژەند. ئەوەندەی پێ نەچوو کردیەوە.
مێردەکەی سەری بەرز نەکردەوە.

بە مێردەکەمم وت: کامران خواحافیز.

چووەوە ئەودیو. دەرکەکەی پێوەدایەوە. برێ تەقەتەقی لێوەهات. مندالە دەستی بە گریان کرد.

مێردەکەم وتی: خواحافیزی چی؟ پێوەند دەگری.
زوو وەرە دەرێ.

من وتم:.... .

دەنگی بە گوێی مێردەکەی نەگەیشت. مندالە تەواو تەواو دەنگی حەوا دابوو. لای کوورەکە بەدوای شووشە شیرەکەدا گەڕا. مندالە تاوی دایێ.

بە مێردەکەمم وت: گەرم نەبێ. ئاگات لی بێ.

مێردەکەم وتی:....

مێردە ئاگای لە قسە هەر نەبوو.( ئەو ژنەی خۆی سوتاندبوو وتی دوای دیسان خولەی بە بنێشتەکەی دایەوە.)

- بۆ زووتر نەهاتی بەبانگییەوە (ژنەکەی خۆی لەدار دابوو).

من وتم: بیر کوا؟ پیاویش... .

پیرەژنەکە کە خۆی دەرمانخوارد کردبوو هەڵی دایە. باسی پیاومەکە چاکیان نییە. (بنێشتەکەی دەمی هەر کەف بوو فڕی دا. یەکی دی جوی.)

- کوا هەموو جارێ وایە؟ شتی چاکیش هەیە. ( ئەو کچەی دوو قسە لە سەری بوو. ١- خۆی خۆی کوشتبوو. ٢- کەس‌و کارەکەی کوشتبوویان، وتی)

- تۆ هێشتا تووشی نەبوویت. (ژنە بەرپرس وتی و دوو بنێشتی‌دی خستە زاریەوە.)

- بووم. وەک ئێوە بەڵام نا! (کچە ئەمەی بەس بە خۆی وت.)

- سەوزە هەی سەوزە سەوزە چاوەکەم.

گۆرانی بۆ منداڵەکە دەوت. منداڵەکە هەر بۆ دەستی دەیڕوانی. دەستی دەکووتا بە ڕەوڕەوەکەیدا.

مورووەشینەکانی دەستی لە تەلی رەورەوەکە گیرا.
دەستی بۆ بەرز نەکرایەوە. کێشای، دیسان کێشای.
نەهات. پەتە پچڕا. دەستی بەر بوو. درا بە ناوچاویدا.
باوکی نەیهێشت بگری. شووشە شیرەکەی تەپاندە
دەمی. منداڵە نیوەگریان و نیوەژیرەوە بوو
مەمکەمژەکەی مژی باوکی لە رەورەوەکەی هێنایە
دەرێ و لەسەر کاناپاکە درێژی کرد. شووشەکەی
پەڕۆیەکی خستە ژێری. رۆژنامەکەی هەڵگرتەوە.
لەسەر کاناپا تاقە کەسییەکە سەری بەسەردا شۆڕ
کردەوە بە مێردەکەمم وت: شیرەکە ئەپەڕێتە قوورگی.

دەنگی وشەکانی رۆژنامەکە نەیانهێشت دەنگ بگاتە
گوێی. منداڵە شیرەکەی دەمژی. بە هەر مژینێ بڕێکی
شووشەکە خۆی بە بەتاڵی دەبینییەوە.

ئەو ژنەی بە سەر منداڵەوەچووبوو چاوی لە عەرز
بڕیو وتی: لە منداڵ خۆشەویستر، ئەویش بۆ ژن، هەر
نییە. (بنێشتی نەجوی.)

من وتم: ژیانیانی منداڵ.

پیرەژنەکەی کە خۆی دەرمانخوارد کردبوو وتی:
منداڵی چی و شتی چی پیاو ئەگەر پلی هەستا رەوەیەک

منداڵیشت هەبێ هەر ژنت بەسەردا دەهێنێ. (بنێشتەی جوییەوە.)

کچەکە وتی: منیش منداڵ وای لێکردم. (قسەی دڵی بە کەس نەوت).

لەدەرکە درا. منیان گەرەک بوو.

- چەپکێ گوڵی لەقەسی دی.

لێم گرت. درگاوانەکە دەرگەکەی شەق پێوە دا. دەلاقەی دەرکەکەی هەڵدایەوە. : پیاو بەو هەموو چاکییەوە. گوڵی لەقەسیشت بۆ دێنێ. تۆیش!

پیرەژنەکە کە خۆی دەرمانخوارد کردبوو وتی: تۆیشیەکێکی لەوان. دمت داخە! (بنێشتەکەی فرِدا).

درگاوان وتی: قسە چی تێ ئەچێ؟ دنیام بەدەستە. ئێوە چاکتان کوا؟

ئەو ژنەی کە سووچەکەی تا ئێستا نەدابوو بە کەس و هیچیشی لە دەم دەرنەهاتبوو چوو بۆ لای دەرگاکە. درگاوانەکە بە چاو تا بەردەمی خۆی تێی روانی.

چاوەکانی دەرپەڕاندو وتی: نەحلەت. درگاوان. تف.

دەلاقەی بە پەلە دادایەوە. دەستی ئەو ژنەی کە هاتبووە قسە گرتم و هاوردمە ناو کۆڕەکەوە. لەپەنای کچەکە دانیشت. کچە بە بەزەییەوە چاوی لێ نەکرد.

- دەردت لەوانی‌تر زیاترە؟

- ژیان بردنە دەردە (ژنە بەرپرس بنێشتی بۆ حەوا دا).

هەموو مۆلەق مان. گوڵە لەقەسیەکە لە دەستم دا وەک شەق‌شەقە دەلەرزا. ددانەکانم بەیەک نەدەگەیشتنەوە. بە دەست باوەشم بە خۆمدا کرد. خراپتر دەلەرامەوە. کچە هەستا. لیفەکەی خۆی دا بەسەر شانەکانمدا. تەکانێکم خوارد. گوڵە لە قەیسیەکەی دەستم کەوتە خوارێ. لەرزەکەم بڕا منداڵە ملچەی دەهات. شیر بەم لاولای دەمیدا هاتبووە خوار. پەڕۆکە تۆزێکی مابوو. منداڵە توند توند هەناسەی دەکێشا.

چاوێکی لە منالەکە بڕی. رۆژنامەکەی بە قینەوە دا بەیەکدا.

- ملچە ملچ حەرامزا.

لەوێ هاتە ئەملاتر. کاناپای منداڵەی بەجێ هێشت. پاڵی دا بەدیوارە سپیەکەوە. دیوارەکەی پێ تەنگ بوو. دوو سێ جار ئەملاولای بەپشتی کرد. خۆی گرمۆڵەتر کرد و ئەمجار پاڵی دایەوە. من وتم: نا.

بەلام تەمایەری قسە نەبوو.

- درگاوان. درگاوان.

درگاوان دەلاقەکەی هەڵدایەوە.

- من وەک بەرپرسی ئەم بەشە پێت رادەگەیەنم لەمەولا ئیزنی ئەوەت نییە هیچ دیارییەک بگەیەنیتە دەست ئەم بەشە.

گوڵە لە قەیسیەکانی لە دەلاقەکەوە حەوا دایە ئەودیو.

من وتم: ژنە بەرپرس رەنگە بۆنی منداڵەکەمی پێوەمابێ.

بە بنێشت جوین وڵامی دامەوە.

چوو لەپشت مێزەکەی خۆی دانیشت و دەستی بە نووسین کرد و بنێشتێکی دی خستە زارییەوە.

- بە گوڵێکی ئاوا لەقەسی هەمووَمان دەخڵەتێنن. (ئەمەی نەوت بەڵام خوێندمانەوە لە چاویدا.)

- پێش ئەوەی بهاتیتایە بیرت لەوانە بکردایەتەوە. ئێرە جێی شتی وا نییە. (پیرەژن وتی).

درگاوانەکە هێشتا دەلاقەکەی دانەدابوەوە.

- .... (شیلەبزەیەکی کرد و رۆی .)

- من و سێو پشتییەکە. چاوەڕوانییە. (ژنەکەی هاتە لامان وتی.)

من وتم: لەژیانی ئێرە وەڕەسم لەوەتی هەین بنێشت جوین کارمانە.

کچەکە وتی: دەستمان بە هیچ کوێ ناگا.

هەستا چووە لای ژنە بەرپرس.

ـ منتان بە هەڵە هێناوە. چاوەڕوانمن.

ئەو ژنەی خۆی سوتاندبوو وتی: بۆ کوێ خوشکێ؟

ئەو ژنەی خۆی لەدار دابوو دەنگی بەرز کردەوە: کێ بە زۆری هێناتی خۆت هاتی.

کچە وتی: من‌و دەزگیرانەکەم.

و دەستی بە گریان کرد. دەستی بە سکیدا هێنا لەوەتی ئەم کچە هاتبوو سکی هەروا بەرز بوو و جارێک وتی: دایکم ئەڵێ: قەڵەو بووی باوکم ئەڵێ: قەڵەو و تەڕەماش هەر سەری دەبڕم. سەربڕین. لە سەربڕین و...

باوەشی پێدا کردم. برێ مات بوو لە سەرم. وتیەوە: بۆ جەژن بوو یا نازانم نازانم. کەروێشکێکمان سەربڕی ئایی ی ی ی چەقۆ کول. کەروێشک دەیزیران. زیڕانی. زیڕانی ئەمە ئەرێ ئەرێ. کەروێشک نا... سەر بڕین.... .

ژنەبەرپرس بردی لەسەر شوێنەکەی خۆی داینا. پەرداخێ ئاوی دایە دەستی.

مێردەکەی خەوی لێ کەوتبوو. منداڵە پشت چاوی شین هەڵگەڕا بوو. ژنە لەبەر ئاوەکەدا پاڵ کەوتبوو. گاز تەواوی حەمامەی گرتبوو. کەپسوولە فیشەی دەهات.

ئەو ژنەی خۆی سووتاندبوو وتی: ...

ئەو ژنەی خۆی دابوو لەدار وتی: ...

پیرەژنەکە کە خۆی دەرمانخوارد کردبوو وتی: ...

ئەو کچەی دوو قسە لە سەری بوو: ١ـ خۆی خۆی کوشتبوو. ٢ـ کەس‌و کارەکەی کوشتبوویان) وتی: ....

من وتم: ....

درگاوانەکە دەلاقەکەی هەڵدایەوە ژنە بەرپرس چاوەکانی تێبڕی. درگاوان هات بڵێ: ....

مێردە خەبەری بووەوە. ژنەکە بەسەر پێوەندا شۆڕ ببوەوە. دەمی نابوو بە دەمیەوە هەناسەی بە دەمیەوە دەکرد. ژنە لە سەر ئەژنۆ دانیشت. دەستی لەسەر سکی منداڵە گرت. نەیتوانی هەستێ. ژنە دەستی نا بەسکی منداڵەدا. دیسان نەیتوانی. منداڵە شیر لە دەمیەوە دەهاتە دەر.

مێردەکە چاوی لە خۆی کرد. هەموو لەشی بنێشتە. منداڵە شیرەکە قلّپ قلّپ دایکی پێی دەهێنایە دەر. بنێشتەکان خۆیان لکاندبوو بە عەرزەوە.

لە درزی زەمەنەوە تۆ

(بۆ: ئەوەی نەیبوو فرمێسک

## .٣.

**باوک:**

دوێنیێ‌شازدەو بیست، دوو حەوتوو بەرلەمەو ئەورۆ دوارۆژی مان.

(مادام ئەورۆ دوارۆژی مانە بێدڵی کردنی وی گەورەیەیەکجار کفرێ.)

رژانی نەوت بەسەر سەربانەکەدا. بەملادا، بەولادا: نابێ ئەم قڵشانە بهێڵم. چە بۆن نەوتێ؟

- باوە جا بۆ بەم شەوە، بەیانی، وەرە خوارێ.

- ...

بەم بەفرە. چاو سەلکە چۆلەکە هیچت پێ ناکرێ. قارەمان کورم. سێوم هێناوەتەوە. هەناریش بچۆرە ژوورێ. بیخۆ. نانا. نایهێڵم ئەم قڵشانە. ئەی چەند ساڵە بۆ دیار نەبوون ئەم قڵشانە. سەرم ئێستا کلووی سپیە. ئەه دە بەفر واز بێنە. ئاخ قارەمان برینی مەعیدەیەتی تف لەو هۆش‌و بیرە. خراپە بۆی میوە. شەمچەکەی

هەڵگرت. گڕی بەردایە نەوتەکە. بۆنی سووتاوی دێ. بانەکە گڕی تێچوو. کوندەبوویەک لە قڵشێکەوە دەرپەڕی. خۆی کوتا بەشەودا. پاڵێکی پێوەنا شەو فڕێی دایە کۆڵان. ئەوەتا ئەگەر بانی کون بوو دەبێتە هێلانەی کوندەبوو. دەستی بەسەریدا هێنا. لە سەری خۆی کردەوە سەلکە چۆلەکەکان پێمەڕەکەی هەڵگرت ئەم دەستەو دەستی پێکرد لە دەستیدا توند گووشی. بەربووە ساوینی بانەکە. دەی تەپانەوە قڵشەکان. پێمەرەکە کەوتە خوارێ لەدەستی هەڵی گرتەوە. توند. توند. نا. ئەمقڵشانە نابێ بمێنێ. ئاگرەکە بایسێ. دەستەو داوێنتم. ژن و منداڵم لە خوارێهان لەبەر ئەم بارە قورسەدا. چاکتر بایسێ. با تەڕ نەبن، ئاگرەکە چاوی کز کرد. ئەوە بۆ خۆش نایسێت.

- ئەی تا ئەوڕۆکانە لە کوێندەر بووی؟

- حیکایەتی قووللە. دەست مەدە لە جەرگم. هی زلێخایە.

- باوکە منیش دێمەیارمەتیت.

- ...

ئەوە باوکە بۆ ناداتەوە هیچ وەلامێ. قارەمان کوڕم وێڵم کە. ئەم بارە بۆ تۆنەهاتووە. من وەک ئەو پیاوەم

کە ناوی... تەححا ناویشیم لەبیر چۆوە. هەرچییەک. دەی . وا گۆی زەوییان نایە سەر کۆڵ من دەبێبۆ خۆم هەڵیگرم کۆڵ بەم خەمەوە. نا بۆ ئەستۆی تۆ هەرگیز ئێستا با ئەمەم تەواو بێت دەچمەبازاڕ شتێک دەکڕم بۆ برینی مەعیدەکەت چاک بێت.

پێمەڕەکەی دەساوی لە قڵشەکان دەیتەپانەوە. ئاگرەکە کزتر دەبووەوە. تۆ بچۆرە ژووریٚ.

لە رووم نایە چاو لە ناو چاوت کەم. تۆو ئەم بارە قورسە. حەیفە. بچۆ با سەرمات نەبێت.

بیهێڵە بۆ خۆم. بۆنی قیرە تواوەکە دەهات. نەوتەکەی هەڵگرتەوە. قڵم. بەم لادا. قڵم بەولادا. نەوتەکە ئاگرەکە خواردی.

باوکە. نەوتەکە لەدەمی ئاگرەکەدا دایسا. ئاگرە بۆ شەو هەستا. کەم پرسیار بکە بگرێ. ئاگرەکە باڵای باوکەی گرتەوە. ئاگرەکە بایسێ. چاکتر بایسێ. کارت نەبێ بەگۆ. ئەم قڵشانە با چاکتر پڕ بێتەوە قیرەکە بتوێوە. با بسووتم با منداڵەکانم نەخۆش نەکەون. زووکارم لە دەرێ هەیە. بەگڕتر ببە. ئاگرەکە لە دەور باڵای باوکە دایسا. باوکە بێمەیارمەتیت . پێمەرەکە لە دەستی کەوتە خوارێ. نا، کوڕم بچۆ ماڵێ سەرمات

نەبێ با لەوە زیاتر نەگرێم. من نابێ ئەم گڕانە بخەمە کۆڵ تۆ. ئاگرەکە بەگڕتر بگرێ. بگڕێ. بگڕێ... ئاگرەکە بڕابوو بە باڵای پیاوەکە لە ناو ئاگرەکەدا بوو. بۆ کۆڵی تۆنە ... کوڕەکە بە پێنجەکەدا سەرکەوت. ئاگرەکە شەوی دەسووتاند. شەونخوون ببووەوە بەسەر باوکە...

## .٢.
## خوا:

## .١.

**دایک:**

دوێنێ شازدەو بیست دووحەوتوو بەرلەمە و ئەورۆ دوارۆژی مان.

(مادام ئەورۆ دوارۆژی مانە بێدڵی کردنی وی گەورەیەیەکجار کفرێ.)

جووتە مەمکەکەی لەسەر کراسەکەی دانا. سپی سپی کراسەکەی لە رەنگ چوو. حەبو شت نەبوو ئەو کات.

چووە ژێر شۆڕەبییەکە. سەری بۆ ناو مەمکەکانی شۆڕ کرد.

- بۆ شیر بە شیر مەمکەکانم بێتە شیر. شەخسی گەورە.

گۆی مەمکی گرت. قامکی شایەتی مان و قامکە گەورەکەی لەم لاولای دەمی توند کرد. بووە غونچە. گۆپکی مەمکی لە نێوان قامکەکانی دەستی راستی نا. نایە غونچەکە. بەری دا دەمی. لە ژێر دار شۆڕەبییەکەدا پاڵ کەوت. هەر دوو قاچی هەڵسپارد. لاقی جووتی دارەکە کرد.

- کوڕەکەم شیر بە شیر دوا رۆژی مانییەتییا گەورە شەخس ئەورۆ.

لە گۆی مەمکەکانیدا هەستی بە تووندبوونێک کرد. کوڕەکەم ئێستا دەیمژێ. دەیمژێ. تێر شیر دەخوا. رۆڵە بەخوا باوکت مراعاتی نەدەکرد. پیاو هەرکردنی لە سەرە. بوونی نا کاری پێی نییە. باوکت مشکڵۆزمت بێ. ئەگەر شیر بە شیرنائەبوویت وا کزۆڵە نەدەبووی. تەواو لەشی مچۆڕکی تێزا. گەرمایەک لە لەشیا تەندرا. چاوی لە گۆپکی مەمکی کرد. لە دەمی شیر مردەدا. ئێستا ئیتر تێر بخۆ لەشیری سپی. شیر مردە نیت. ئیتر چاوەکانی لێک نا. با منیش چاو لێک نێم. شیر مردە نیت. چاوی بۆ دەمی کردەوە. شیرمردە شیر بە

لاشەویلکەیدا هاتبووە خوارێ. لەژێر دارشۆڕەبییەکەدا پاڵ کەوتبوو، دارشۆڕەبییەکە خۆی بە بەردا دەخست. خۆی بۆ دواوەوە دەخست. زیکری بەسەردا دەکرد.

# .١٣٠

دۆست:

دوێنێ شازدەو بیست دوو حەوتوو بەرلەمەو ئەورۆ دوارۆژی مان.

(مادام ئەورۆ دوارۆژی مانە بێدڵی کردنی وی گەورەیەیەکجار کفرێ.)

- چەندی ماوە؟

-نۆ دەقەو نۆ چرکە.

- دەستێکی هێنا بە زگمدا. ئەی زگم بۆ ساردە. جووڵەیێ. بزوانێ. هیچی تێدا بەدی ناکرێ.

دەسێ بۆ مەمکی برد. شل، شل زەکیش ئا هەر نییە. دەی ... ئەزانی حەزم، حەزم لێیە کچێکمان بێ چاوی رەش، نانا ئەو چونکە حەزی لە چاوی سەوزە. با سەوز بێ. سەوزە کەڵەگەت. زیت و تێگەیشتوو. ئەرێ راستی ناوی. خۆ بیرمان لە ناوەکەی نەکردۆتەوە. ناوی ئەنێین... ئەنێین... .

- دەی تۆ خوا ئەکات دەبێ.

- برایمۆک ساعەت چەندە؟

- ماویەتی.

- من ئێستاکە ئەبوایە لە خەستەخانە بمقیژانایە. ئەزانم هەمووی هی ئەو حەبانە بوو. رۆڵە کچم حەب مەخۆ. خراپە. دوای هەر لێ نابیتەوە. بریا بەقسەم بکردیتایە دایە. ئێستا ئەو کوڕەی وا برایمۆک حەزی لێی بوو بەڕێوە بوو. چاوڕەش، وریا، قارەمان، سپی کەلانە، راستی ناوی چی لێ بنێین. ناوی ئەنێین... ناوی.... دەی جارێ. با بزانم لێ ئەبمەوە.

- نۆ دەقەکەی رۆی.

- دەڵێم با بچینە خەستەخانە. رەنگە ئەوان شتێک بکەن.

- باشە خۆ من ژان نابژێرم. چاوی لە دیوارەکە کرد. سپی، سپی، دەستێکی بە ناوچاوییەوە گرت. سرپسڕ. چاوەکانی لێک نا. برایمۆک چاوێکی بۆ هەڵبڕی.

- چ شیرین خەوتووە.

باشە خەوی چی ئەو دەبوایە ئێستا بە منداڵ بوونەوە بوایە. دەی، هێشتا ماویەتی، دەمی هەناسەی

توندی پێدا دەهات و دەڕۆیشت. قڵیش قڵیش ببوو. بە زمان قڵیشەکانی تەڕکرد.

ـ ئاخ... .

ددانەکانی لە لێوی گیراند. خوێن، خوێن لە قڵیشەکانەوە هەڵقوولی. چاوەکانی هەر نەکردەوە. قۆڵی کراسەکەی بردو خوێنی قڵشەکانی پێ خاوێن کردەوە. شیرین ئەمڕۆ نەیتوانیوە شانەی کات قژی. لەسەر گوڵە شینەکانی قاڵییەکە دانیشتووە. قژی درێژ جوانە بەڵام بەر دەست دەگرێ. راست دەکەی. دەی دوای ئەوەی لێ بوویتەوە قرتی کە، بەرچاویشت هەر زۆر درێژە رێکی دواوەی کەیەکسەر.جووڵەیەکی کرد. دەستی لەسەر زگی دانا. لێوەکانی برد زگی ماچ کا. نا نا شیرین حەزی لێیە سەرشانی ماچ کرێ. (برایمۆک تەزێکی ئەوەندە خۆش نازانی نازانی وەک چی وەک ... وەک ... نازانم چی دەی هەرچییەک بێ لەلەشما پەنگ ئەخواتەوە. جا باوەشت پیائەکەم. سوورسوور ئەبمەوە. لەشم ئەزریکێنێ. لەرزینێکی خۆشم تێدایە.) ئەرێ با ئەم ژان نەگرتنەی بیرچێتەوە جارێ. قۆچپەکانی دوانی لێ کردەوە لێوەکانی برد و لە سەر شانی داینا.

ـ ئای.

داچڵەکا. هەستی بە شتێک لەسەر شانیدا کرد. چاوی کردەوە و سووڕانی بۆ سەرشانی. هیچ دیار نەبوو. سەری توند بۆ سەرڕانی دانەوانەوە. پەرچەمی لە دواوەی جودا بووەوە. دەستی بۆ دەستی برایمۆک برد. سارد، سارد، دەمی دانەواندو لە سەر ڕوومەتەکانی دانا.کلووی بەفر، بێ َدەنگ.

- برایمۆک هەستە. پشتم داویە لەرزین. هەستە پشتم.

پەرچەمی لەسەر گوڵە سپیەکانی قاڵییەکە نیشتبوو. دواوەی قژیشی سەرگوڵە شینەکانیان گرتبوو.

# (جەڕا)

شارەداری بەڕێزی قڕەجاڕ:

ئێمە دەرەقەت زبڵەکانی ناوشار نایین. تکایەیارمەتییەکمان دەن.

لیژنەی زبڵڕێژەکانی قڕەجار.

شارەدار نامەکەی هەڵگرت. بێئەوەی ساکەکەیشی هەڵگرییەکسەر تا پایتەخت ر انەوەستا. بیۆەی ئیزن لەپاسەوانی بەردەرکەکەیش بخوازێ خۆی بە ژوورەکەدا کرد. پاسەوان بەدوایدا هەڕای کردە ژوور شارەدار پەلەی دیتنی سەرۆکی بوو.

- سەرۆک سەرۆک گیرمان کردووە.

لە ناوەندی ژوورەکەدا راوەستا. چاوی لە هەر-چوارلا کرد بێجگە لەسەندەڵییە چۆڵەکان هیچێکی دی دیوەکەی داگیرنەکردبوو. بەپەلە ئاوڕی دایەوە. بچێتە لای دەرگاکە. پاسەوانەکە لە پشتیەوە بوو. بەیەکدا دران.

- ببوورن.

- به ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم، ئێوە هەر ئێستا بدەمە دەست سەرۆکی زیندان.

- بۆ بۆ چم کردووە.؟

- قەسدی ئێوە لەم راکردنە چ بووە؟

نامەکەی به پەلە لەگیرفانیدا دەرهێناو بەرامبەری رایگرت.

- گومانم زیاتر بوو. ئێرە خۆشارەداری نییە.

پەلی گرتو دایە دەست سەرۆکی زیندان.

***

مونشی سکرتاریا فاکسەکەی خوێندەوە:

*بەرێز شارەداری قرەچار.*

*زبلرێژکانی ناوشارمانییان گرتووە تکایە زوو خۆتان بکەیەننەوە*[1].

*به سپاسەوە: جێگری شارەداری.*

---

[1] نامەکەی شارەدار نەگەیشت چونکە شارەدار حوکم دراوە بۆیە ئیزنی هیچ جۆرە پەیوەندییەکیش نابێ لەگەڵیدا هەبێ.

دەواخانەکان بەرنەدەکەوتن، لە چەند کاتژمێردا ئەوەی ماسبک بوو رۆی. ئەوەی لەدەرەوە دەهات زوو خۆی بە ژووردا دەکرد.

- کەسی لێ نییە با زوو بچم.

بەڵام دەست بەجێ پەژیوان دەبووەوە. تا تاریکانیش بەری نەدەکەوت. ئەوڕۆژە لە ژوورەکاندا رۆژ نەکرایەوە.

- پیاوەکە بڵێی کاتژمێر چەندە بێ؟

- ئەها پەنجەرەکە.

- خەو بەسە رۆڵە. هەستە منیش خەوم زڕاوە.

- کوا کەڵەشێر خوێندی؟

- پیاوەکە ناچی بۆ نان؟

- .... .

***

پیاوێکی قرەجاڕ کاری دەست بەئاو تەنگی پێهەڵچنی. تەمایەر بوو رۆژ کاتەوەیەکسەر هەستێ.

- شەوییەڵداش ئاوا نەبووە.

لێفە قوورسەکەی لەسەر خۆی لابرد و خۆی پۆشتە کردەوە. پشتی درگاکەی لابردو درگاکەی کردەوە. فریا

نەکەوت چاو هەڵ گلۆفینەکەی تەواو کات. زرم درا بە عەرزدا. بۆگەنێکییەکجار پیس لووتی پێگرت.

- ئەم زبڵە کێ کردوویەتە حەوشەکەم؟

زۆر بە ئەزیەت زبڵەکانی دەورووبەری خۆی لابرد. هەستایە سەرپێ. حەوشە هەر دیار نەبوو. قووتووی ریکا، شووشەی ئاو تەماتە، توێکڵی مۆز و شووتی و پێشەو ... زۆر شتیتر لە ژوورەکەدا بوون. چوو پەردەکەی هەڵدایەوە. لەوێوە بچێتە دەر. پشت پەنجەرەکە تاریک تاریک بوو. چووە ئاشپەزخانەکە. ناو حاجەتەکانی گەڕا. کەوگیرێکی پەیدا کرد و هاتو کەوتە هەڵدڕینی زبڵەکە.

***

پیرەژنێک هەستا نوێژ بکا. چووە دەست بە ئاو، ئاوی بەردایەوە.

- ئەو بۆ نییە؟ چی بکەم، راستی خۆ شەو دەست نوێژم بوو، خەوم لێکەوتبوو؟ نەکەوتبوو؟ گوێی پێ مەدە گومان دروستە دەی.

نوێژەکەی کرد. خۆی پێچایەوە بچێ کولێرەی گەرم بۆ بەرقلیان بێنێ. چووە لای درگاکە. بە کلیل قوفڵی درگای کردەوە. پاڵی لە دەرگاکەوە نا بیکاتەوە. دەرگا

وەلامی نەدایەوە. دیسان پالّی پێوە نایەوە ئەمجارەیش هەر وا. زرم کەوتە گیان درگاکە. درگا ئەمجارەیش نەیبیست.

- ئەی هاوار چی بکەم؟ ئەم درگایە دیسان خەراپ بوویەوە.

کونێ لە درگاکەدا بوو چاوی نا بە کوونەکەوە.

- هێشتاش شەوە.

دوو سێ جار لووتی هەڵلووشی. بۆنێکی بە خۆیەوە کرد. بە ژوورەکەدا سووڕێکی خوارد. چووەوە لای درگاکە.

- ئەو بۆگەنە ناخۆشە؟

چووەوە ناو جێگاکە. راکشا.

- ماڵەکەم بۆگەنی کردووە. بەخوا ژنێکی پیس و چەپەڵم. بەکار نایێ بەیانی دەیخەمە دەر.

***

دۆکتۆر باوێشکێکی دا. سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد.

- دەک دواتِ بڕێ دیسان باتری؟

هەستا چوو بۆ لای پرێسی کارەباکە. پرێسەکە تەقەی لێوە هات. گلۆپەکە هەڵنەبوو. دوکتۆر دوو سێ

تەقەی دیکەی لێوە هێنا. گڵۆپەکە هەڵنەبووەوە. چوو بۆ لای تەلەفۆن.

ـ ئەمە خۆ ئیش ناکا؟

چووەوە سەر تەختەکەی. مەلافەکەی دایەوە بە خۆیدا.

ـ دەی بەیانی ناچمەوە نەخۆشخانە. دەڵێم تێ کەوتم نەمتوانی بێمەوە.

***

قڕەجاڕ قڕەجاڕی سالآن نییە. ئەو شارەی خۆشی و خۆشەویستی لێدەباری، هەموو کۆڵان و گەڕەک و شەقامو حەوشەو... قڕەجاڕ زبڵ گرتوویە. کەس نازانێ سەرچاوی زبڵ لەکوێوە بووە. کارناسان و پسپۆڕان خەریکی پشکنین و لێکۆڵینەوەن لەم بارەوە، را زۆرە.

ـ رەنگە لە هەسارۆکێکی دییەوە کرابێتە ئێرە. (کارناسی جوگرافیا)

ـ زبڵدانی مێژوومان بیستبوو بەڵام ئەمەیان نازانم چیتان عەرز کەم. (کارناسی مێژوو)

ـ ئاوو هەوا هیچ گۆڕانێکی تێدا بەدی نەهاتووە کە بێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەم زبڵانە. هەڵبەت ئەمە قسەیەکی زانستی نییە، هی خۆمە. (کارناسی ئاوهەوا)

ـ تاقی کردنەوەی خواوەندی باریتەعالایە. (مامۆستای ئایین)

ـ هیچ نییە کەشکە. (بێکاری قرەجاڕ)

هەڵبەت ئەمانە را سەرەتاییەکانن. دەبێ چاوەڕوانی داهاتوو بین. بزانین رێگە چارەیەکی بۆ دەدۆزرێتەوە. بەلاّم ئەوەی کە شایانی باسە ئەوەیە: قرەجاڕ ئێستا لە بارو دۆخێکی خراپدایە. هەر لەو رۆژەوەی زبڵ شاری داگیر کردووە، لۆدێرەکانی شارەداری لە گاراژ هاتنە دەرو کەوتنەخاوێن کردنەوەی شار. جێگری شارەداری لە سەردانییەکەمماندا فەرمووی: تا ئێستا چەند کەوچکێ شکاوە. دوو دانە لە لۆدێرەکان هەریەکسەر لەکار کەوتوون. بەلاّم ئێمە وەک هەمیشە کۆڵنەدەر بووین و هەر وەک هەمیشەیش بۆ شەڕ لەگەڵ ئەم زبلاّنەیش ئامادەین.

قرەجاڕ ئێستا بۆگەنێکی دێ بنیادەم کاس دەکا. هەموو خەڵک بەماسک لێدراوی هاتو چۆ دەکەن.

سەرۆکی ئاقاری ژینگە لە چاوپێکەوتنی ئەمرۆماندا وتی: ئەم زبلاّنە هەر چەند شارەکەمانی دزێوو ناشیرین کردووەو بووەتە هۆی رەنجانی خەڵکە بە تاقەتەکەی شارە خۆشەویستەکەمان. بەلاّم لەم لاترەوە بووەتە

هۆی ئەوەی کە سەرەنجی جۆرە باڵندەیەک بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. کە هەر چەندەسەیری دەکەی لە قەل دەچێ بەڵامئەوەندە لەباری ئەندامەوە زل و زەبەلاحن کە لە داڵەکەر خۆرەیش دەچێ. هەر لەیەکەم ڕۆژی ڕوودانی ئەم ڕووداوەوە ئەمانە تەموورەی زبڵەکانیان داوەو هەر دەیخۆن و دەیخۆن و دەست بەجێ ڕیقنەیەکیشی بۆ دەکەن ڕیقنەکانیشیەکجار زلە بەقەدەر هێلکەی قازێک دەبێ. بەشکەم ئەم باڵندانە بتوانن ببنە هۆی نەجاتدانی شار.

خوێنەرە خۆشەویستەکان ئەمە بارودۆخی شارە. هەر چی دووکانە بەستراوە ئیدارەکان تا حەوتوویەک داخراون. پەیتا پەیتا لەسکرتاریایشەوە پەیام و هەواڵ دێکە لەبیری قرەجاڕدان. ئەم شارە متمانەی زۆریان بەم قسە هەیە. تەنانەت جێگری شارەداری لە دووەم چاوپێکەوتنماندا وتی: سکرتاریا بەتەمایە ئەگەر بارودۆخ زۆر شڕ بوو ڕەشماڵ لە دەرەوەی شار هەڵدا خەڵک پەنا ببەنە ئەوێکانە. ئازووقەیش قەرارە بنێرێ. داوای لۆدێرمان کردووە. زبڵەکانیەکجار زۆرن. غەڵتەکەکانیشمان خستوەتە کار، زبڵەکان پان بکەنەوە. بۆوەی ڕێگاوبان خۆشتر بێ ئێمە هەموو خەریکین. بزانین چی دەبێ.

هەموو هەوڵ دەدەن رزگاری کەن بەو هیوایەی قڕەجار بێتەوە قڕەجاڕی پێش زبڵەوە.

ئامادەکردنی: ڕۆژنامەوانی قڕەجاڕ

***

دەنگی ئاژیری ئامبلانسەکە کە گەرەکی بوو وەک فیشەک دەرچێ قڕەقڕی خستبوە قڕەجاڕەوە. چەند جارێک لەسەر زبڵەکان هەڵخلیسکا. دەست بەجێ خۆی گرتەوە. خەڵک هورووژمیان بۆبرد. سەریان پێهێنایە دەر پێشتر پەڕۆکەی گرت بە لووتیەوە.

- جێم نییە لە کوێتان دانم؟

- لە نەخۆشیشدا پارتی بازی، سەگبابینە؟ (ئەوەی مناڵە شل شل بوەکەی بەسەر دەستەوە بوو)

- نامبەی چێوشەقکەیشم بۆ دەشکێنی. چی بکەم بۆ دەست بە ئاو؟ (ئەوەی لەدواو دواوەوە چێوشەقەکە دوو کووت کراوەکەی دابووە بن باڵی)

- کێ وتی بێتە بەر ئامبلانسەکە؟ (سەری بەردە ناوەوە) پێیان وایە من بەرپرسی ئەم نەخۆشیمە.

- من بە بای سکم بۆ ناگیرێ ئابڕووی پێوە نەهێشتووم. (کوڕی پیرەپیاوەکە کە خۆی دابوو بە سەریدا)

- ئەمە گشتی پیلانی خۆتانە. (بەڕێز نامەردانی کە کتێبێکی بە دەستەوە گرتبوو)

ژنەکە لەبەر ماشینەکەدا خۆی دا بە عەرزدا. لەچکەکەی بەپەلە داگرت. دەستی بە رنینی قژی کرد. هەر رنی، هەر رنی، هیچی دەستنەکەوت. یەخەی خۆی دادڕی، دەستی بە سینگ کوتان کرد.

- مێردەکەم سێ تەڵاقەی لێ خواردووم لەسەر قژم، کڵاوگیسێکم گەرەکە.

- وەڵڵا بیلاهی هی نەخۆشیەکەیە. چاک دەبیتەوە.

فێرکاری قڕەجاڕ بە خۆی و مایکرۆفۆنەکەی دەستیەوە دەستی پێ کرد: خاڵەی شۆفیر بەس دەمەوێ دەورێک سوارم کەی بۆ ئەوەی بە مناڵەکان رابگەیەنم کە مناڵە خۆشەویستەکان، بەهۆی ئەم نەخۆشیە نەگرسیە کە کەوتۆتە ناو شارە ژیکەڵەکەمان قوتابخانە خۆشەویستەکەمان جارێ دەبەستین تاکوو بەتەمای خوا بزانین کەی خەلاسیمان دەبێت و دیسانەوە بچینەوە پۆلە رازاوەکەمان.

گشتیان پەڕۆکەی بەرلووتیان لابرد: ئێستا کەی وەختی ئەم هەڵیتوپەڵیتەیە.

پەڕۆکەیان نایەوە بە لووتیانەوە. بۆگەن کەمتر بوەوە. بوڵبزێرەکەی شارەداری لە سەر تەپۆڵکەیەکی زبڵەوە راوەستابوو. کەوچکەکەی پڕ لە خەڵک بوو لەم بەر زبڵەکەوە دای دەبەزاندن.

- ئەوە خۆ بۆگەنەکە پیستر بووە. چۆن ماون؟ (ژنێک لە ناو کەوچکەکەوە.)

- دەواتان هێنا؟

- بۆ خاوێنی بڕیارە چ بکرێ؟

- دوکتۆرە هەندەرانییەکان بوون بە چی؟

- ئۆدکۆلۆن دروست نەبوو؟

ئەمبلانسەکە ڕێگەکەی بەستراو دیت. دزە ڕێگەیەکی لە ناو دارەکانەوە دیت هێواش پێی نا بە گازداو بۆی دەرچوو.

- ئەوە بەلانیسبەت ئەو واوا لێهاتووە چی لێ هات؟ (پۆتینێکی خوێڕی)

- قەت ئاوا بە هیچ ناگەین! (بە ڕێزمەردانی)

پەرۆکەیان هەر بە لووتەوە بوو کە چاویان لە ئامبلانسە دەکرد کە دوور کەوتبوەوە.

***

بولبزێرەکان و غەڵتەکەکان تەمو مژ و هەور لە کاری خستن. تەمو مژ هەموو کێوەکانی بزر کردبوو. تەمو مژ یەکجار خەست بوو. پەنجەرەی ماڵەکان ئیتر هیچ کوێی لێوە نەدەبینرا. هیچ بەرپرسێک بۆ ئەم تەمو مژە فرمانێکی دەرنەکرد. بەتەما بوون خۆی دەست هەڵگرێ. هات و چۆکانی ناوشار تەواو کەم ببوەوە. رێگاکان هەموو داشارابوون. رێگەکان بەتەما بوون لەبارینی ئەم تەمو مژەدا خاوێن ببنەوە. کەچی تا ئێستاش هەورەکان لە جێگای خۆیاندا بوون.

نامەیەک بۆ قرەجارِ:

بەرێزان کات تەنگە.

بۆوەی رزگارتان بێ هەورە نەزۆک و نەبارەکان تووشی بارین کەن. دەرکردنی نەگریسی ئێوە بەوەوە دەروا.

نەخۆشخانەی پایتەخت: دوکتۆر ژیاوە

کەوتنە خۆیان، دەمو دەست چەقۆ لە کار کەوتووەکانیان خستە گڕ، دۆخینەکانیان بۆ شل کردەوە.

شارەوانی شار

دوای ڕێز:

پاکەتێکی گوماناویمان بۆ ناردراوە تکایە بەدوادا چوونی پێویست بکرێ.

***ناونیشانی پاکەتەکە: کن قوتابخانەی قرەجاڕ. ماڵی ڕۆتینێکی خوێڕی.***[1]

***بە سپاسەوە: سەرۆکی پۆست***

سەرۆکی شارەوانی بێ سێو دوو لێکردن دەستی پێکرد. پیلانێکی لە پشتیەوە دەدیت. زۆر زوو کۆبوونەوەیەک. زۆر زوو دەستووریێک. زۆر زوو بەڕێوەبردنی و وێستانی ماشین گەلێکی زۆر لە سەر

---

[1] ئەمە ناوێکەدوکتۆر کەژاوە بەهۆی شتە تاکەکەسیەکانەوە بڕیویەتی بەسەریدا.

شەقامی ماڵی پۆتینێکی خوێڕی. رژانی پۆلیسی ماسک لە سەر بە کۆڵان و سەرباندا. بۆگەنە لە تەم و مژەکەدا وەستابوو. ماسکەکەی داگرت.

- پۆتینێکی خوێڕی خۆت بەدەستەوە بە.

ماسکەکەی نایەوە بە دەمیەوە.

(سەرۆکی شارەوانی لە وتو وێژێک کە لەگەڵ رۆژنامەی ئاوەیانی قڕەجاڕدا هەیبوو بەم پرسیارە ئاوا وەڵامی دایەوە.

- گومانی ئێوە چی بوو کە ئێوەی هێنایە سەر ئەو رایەی کە پێ دەچێ ئەم پاکەتە...

- ئەو پاکەتە لۆغمی تێدابێ. نەخۆشیەکی تێدابێ. رەنگە ئەو نەخۆشیەی قڕەجاریش هەر بە کردنەوەی دوو پاکەتی ئاواوە دروست بووبێتیا رەنگە نامەیەکی شاراوەویاخود هەڕەشەویا رەنگە رەنگە رەنگە رەنگەو هەزاران شتی دی.

- بەڵێ بەڵێ هەر شتێکی ئاوا.

- نەخێر ئەم پاکەتە کاتێ سەرنجی ئێمەی راکێشا کەدوای ئەوەی سەرۆکی پۆستیەکەم پاکەتەی بۆ ناردین سێزدە پاکەتی دی هەر لەو چەشنە نامەبەرەکانی‌دیش هێنایان. ئێمە گومانمان کرد بۆیە

هەروا لەرووی نەفامییەوە دەستمان بە کردنەوەی نەکرد. بڕیاری گرتنی پۆتینێکی خوێڕیماندا ئەوجا...)[1].

---

[1] ڕۆژنامەوانەکە دوایی بە هاوکارەکانی وت: سەرۆکی شارەوانی ترسنۆکە چونکە وت‌و وێژ تەواو نەبوو وتی: قەرارێکم هەیە و ڕێک من وام بۆ دەرکەوت، کە سەردانی پۆتینێکی خوێڕی دەکات. (ئەمە مەحرەمانە بوو.)

پۆتین نەهاتە دەر. سەرۆک هەر تەمایەر بوو. ماسکەلە ژێرەوە عارقەی بە هەمووان کردبوو. زوو زوو دەستیان بە ماسکەکەیاندا دەهێنا و ئارەقەیان ئیشک دەکردەوە. سەرۆک عارەقەیشی ئیشک نەکردەوە. چاوی لەدرگای پۆتین بڕیبوو. پوتینێکی خوێڕی هەر نەهات. تەمو مژ پۆلیسەکانی داپۆشیبوو. سەرۆک لەرزێکی لێ نیشت: نەکا ئەم تەمو مژە ببێتە هۆی دەرچوونی. بیئەوەی بە کەس بڵێ ملی ڕێگای پۆتینێکی خوێڕی گرت. چەند جار قاچی هەڵ کەوت. کە چاوی لەبەر پێی کرد پۆلیسێکی خۆیەتی.

(بڵێی ئەم پاکەتە چی تێدابێ؟ ئەو بۆ ناخۆشەی ناوی منی کوشتووە.)

لە بەر درگاکەیدا کۆمەڵە کلیلەکەی گیرفانی دەرهێنا.

(لێم سوورە زیڕو شتی وانییە. ئەی تەقەی کوا؟)

چووە حەوشە. حەوشەیەکی پڕ تەمو مژ. هیچ گڵۆپێک لە ناو تەمو مژەکەدا دانەدەیسا. خۆفێک گرتی، (بچم، نەچم، خۆی مات نەدابێ؟)

- ئاییی .

خۆی نووساند بە دیوارەکەوە. بێهەناسە هەڵکێشان. دیوارە ئەتوت ئاوە کوڵی پێدا ڕژاوە. دیوی

دەرەوەی ماڵەکە سوورسوور بوو. گوێی بۆ دەنگە ڕاگرت. هیچ، دەستی بۆ دەزگیرەی دەرگا گێڕا.

( ئەم ڕوت و قووتە چییە؟).

دەستی لە درگا کردەوە. دەستی برد بۆ ژنە. دەستی بەسەرو سینگیدا هێنا. سرپسر.

(ئاخ بۆ ژنێ. ئەم پۆتینەش چ سەیرە.)

دەنگی خشەخشێک ماتی کرد. پەنجەرەیەک لە حاست درگاکەوە بوو. چوو، یەکێکی دی. پشتی لەم بوو. ڕووت ڕووت. موویەکییەکجار زۆریش لەشی داپۆشیبوو. ڕووی بۆ ئاسمان حەوادابوو. دەستی زووزوو تەکان دەدا. دەنگێکی نائاسایی وەک ئەوەی هائێستا ناتاوێکی دی هەناسەی بچڕێ لێوە دەهات. ژوورەکە بەس جێگایەکی داخراوی لێبوو. پەتوویەکیش کە فڕێ درابووە ئەولاتر. سەرینێکی سووری گەورە لە ناوەندی جێگادا ڕاکێشرابوو. کۆرسێتێکی سووری تۆڕی توند کرابوو لێی، جێ مەمکەکانی بۆش بۆش داکەوتبوو. شۆرتێکی سووریش بە لاخواروویدابوو. قاچێکی دەرهاتبوو.

- ئۆئۆخخەیش... .

و خۆی دا بەسەر سەرینەکەداو پاکەتەکەی دەستی لەسەرەخۆ دانا. هەستایەوە. سەیرێکی سەرینەکەی کردەوە بەربووە ماچ کردنی سەرینە. توند، توند، توند، توند.

*بەرێز سەرۆکی پۆست.*

*دوای سڵاو؛*

*وڵامی پاکەتەکەی پرۆتینێکی خوێڕی ئاوایە: هیچ لەو پاکەتانە مەترسن کە ناردراوی پرۆتینێکی خوێڕییەو دەبێت بکاتە ئاسمان.*

*بەسپاسەوە: سەرۆکی شارەوانی*

# پلانی (١)

مامانه خۆماڵییەکان وایان بیرکردەوە:[١] ئەگەر کچێنی چەند کچ بدڕێ باران دەبارێ. خا لیلێ ئەرکی ئەم کارەی لەئەستۆ گرت. درگای ماڵەکەیان لەسەر شەقام بوو. درگایەکی دی تێخست بۆ سەر کۆڵان. یەکەم کچ بە تەنێ خۆی بەژووردا کرد. خالیلێ لە سەر لێفەیەکی چوارقەدکراودا دانیشتبوو و بڕێ شتی لە دەور خۆی کۆ کردبۆوە. مۆری[٢] دەرزی و دەزوو[٣] بتادین، دۆشەکەیەکی داخراو و سیخێک. کچە خۆی چوو لە سەر دۆشەکە پاڵ کەوت.

---

[١] ١ - ئەو چەند رەسمە: ١- بووکە بارانە. ٢ - پیاو خستنە ناو ئاو. ٣ - کڵاوی سەر مەرقەدی پیاوچاک, هەموو پێویستی بە ئاو بوو، قڕی ئاویش لە قڕەجاڕدا هاتبوو.

[٢] دەڵێن خالیلێ مۆریەکانی دەدایەوە بە کچەکان. کە شوویان کرد لەگەڵ خۆیان ببەن.

[٣] خالیلێ چاوی چاک نەیدەدی لەزۆریەک لە منداڵ بوونەکاندا ژنانی سەقەت دەکرد و کاری دەخستنە دوورینەوە.

یەکەم جار عەلیکە سلاو. دووەم جار نامەکەت کوا؟[1]

- من هاتووم بەس لەبەر بەڕێزمەردانی.

- وتم نامەکەت کوا؟

- کەس نەیزانیوە.

---

[1] ئەو کەسانەی کە دەهاتن دەبوایە ئیزن نامەی براو باوک و کەس و کاریان پێ ببوایە.

# پلانی (٢)

- تۆخوا نا نا. من دەترسم. ئێشی دێ. تۆ ئەو قورئانە. تۆ ئەو خوایە.

بە چوار پیاو هێنایانە ژوورەوە. فڕێیان دایە بەردەم خالێلێ. خالێلێ تۆزێ حەپەسا. چوار پیاوە هەریەکەو لەقەراخێکی دۆشەکە دانیشتن. چوار چەقەڵی کچەیان لە سەر دۆشەکە راکێشان. دوانییان هەر دوو دەستی. دوانییان هەر دوو قاچیان گرت. کچە چرکەی لێ بڕا.

- خواااااا.

خالێلێ سیخەکەی هەڵگرتو چووە بەر قاچەکانی کچە. کچە بزوانی لە خۆی چنیبوو. دوو پیاوەکەی سەرەوەیەکی زللەیەکیان لەملاو لای کچەکە دا. کچە چرکەی هەر نەکرد. خالێلێ دووسێ نەقورچکی لەلارانەکانی گرت. هیچ. ئەو پیاوەی قاچی چەپی کچەی گرتبوو گوێی بە دڵیەوە نا.

- .....

# پلانی (٣)

کچێک لەگەڵ کوڕێکدا هاتنە ژوورەوە. زۆر بەڕێزەوە لە لای خواری ژوورەکە دانیشتن. بێئەوەی خالیلێ داوای نامە کات کوڕەکە نامەکەی نایە بەردەمی.

- من برای ئەم کچەم.

خالیلێ چاوێکی لە کوڕەکە و چاوێکی لە کچەکە کرد بۆی کچەی زیاتر روانی. کچە دەمووچاوی گەچ بوو. کچە لە ژێر چاوەوە لەکوڕەو خالیلێ روانی. کوڕە پەلی گرت. پاڵی خست لەسەر دۆشەکەکە.

- نەترسی هیچ نییە. بەقەدەر دەرزی وەشاندنێکە.

کچە دەستی فڕێ دایە ئەولاوە. مۆڕەی لێکرد. خالیلێ چاوی لێبوو. سیخەکەی دانا.

- هەستە.

- بۆ کوێ خالێلێ؟ ئەم قوربانییە ئەکەم بەڵاکەمان لەسەر لاچێ.[1]

- ...

***

داوێنچی لە ماڵی بەڕێزنامەردانی لایەنگری دۆزیوەتەوە. داوێنچی کتێب نەما, نەققاشی نەما لەم ماڵەدا چاوی لێنەکرابێ. بەڕێزنامەردانیتەنانەت لە رووی نەققاشیەکانەوە نەققاشی کێشایەوە.[2] لەقاپی گرتو واژووی خۆیشی لێدا:داوێنچی(۲).

---

[1]بەقسەیەک گوایە ئەم کوڕەبرای کچەبووە خۆی پەلاماری داوە بە قسەیەکی دیش دەڵێن دەزگیرانی کچەبووەو پەنی پێ داوە. بەڵام رێی تێ ناچێ دەزگیران کاری وایشی کردبێ وبیشی هێنێ بۆ لای خالێلێ. پێ دەچێ خالێلێ ئەمەی بیستبێتەوە.

* خا لێلێ ئەم پیشەی لابرد. مامانە خۆماڵیەکان لێی دەگێڕنەوە: کەس نەدەهات، کە دەیشهات قسمەت نەدەبوو.

[2]وا بیر نەکرێتەوە یەک شەوە بووە نەققاش. بۆ کێشانی ئەم نەققاشیانە بیری منداڵیی تیژە. کاغەزێکی هێنا. بە لۆکەتەواوی نەوتاوی کرد. کاغەزەی نایە سەر نەققاشی. قۆڵی هەڵماڵی کێشایەوە.

دایرەالمعارفێکی[1] باڵندەکانیشیی هێنا. لێیان وردبوویەوە. دەنووکیان. قاچیان. باڵ و تەنانەت سووچ بەسووچی کتێبە گەڕا بزانێ شێوەی ڕیقنەکردنیان چۆنە. بەڵام مخابن. زۆری حەز چووە تاوس. دایرەالمعارفەی لە ژێر دەستی دانا. ئەوەندەی بڵێییەک و دوو کێشایەوە. حەزی لێ بوو تاوسە ڕەش ڕەش کا. ڕەش ڕەشی کرد. حەزی لێبوو خاڵ خاڵی خۆڵەمیشی بۆ بکا. بۆی کرد. ئامادەی دروستکردن. چەکوش. میتر، ڕەنگ، بزمار، نەخشە، چەند لە چەندبێ؟ دەنووکی چ ڕەنگ؟ شاخی چۆن؟ باڵی چۆن؟ دروست کرا. بە پەلە پەتێکی هێنا. خستیە کەمەری. کێشایە سەربان. لەسەربان پەڕۆکە کەگرتبووی بە بەر لووتیەوە گرێی ترێ لێدا. بۆوەی لە ناو تاوسەدا نەکرێتەوە. تەمو مژ حەوشەیشی تەنانەت پڕ کردبۆوە. قرەجاڕ لەسەربانی دوایێنچی (٢) دیار نەبوویا هەر نەبوو. عەینەکە ڕەشەیشی لێدا. هیچ کوێی نەدی ئاوڕی بۆ تاوسە داوە. نەبوو. عەینەکەی داگرت. گوێی نەدا بەم پێشنارەیش: لە کاتی تەمو مژدا

---

[1] ئەم دایرەالمعارفە هی ئەو کڵاوبەردارییە بوو کە لە پایتەختدا کردی. (ئەو بیرەوەریانەی کە دانرابوو کاتێ بەناوبانگ بوو بخوێنرێتەوە.)

هەڵفڕین قەدەغەیە. چووە ناو تاوسە. ئەتوت تاوسی بەڕاستیە دەستی نا ناو باڵی. قاچی نا ناوقاچی. سەری خستە ناو سەری.

یەک، دوو، سێ، خواحافیز. قڕەجاڕ من ڕۆیشتم. من خزمەتگوزارم.

دوو سێ جار دەستیشی بۆ بادا. ملی بۆ ئەم بارەوبار کرد و بیری دەکردەوە .[1]

- زرمممممم.

***

هەورەکان هەر زیاتر دەبوون. ئەم باڵندانەیش کە سەرۆکی ئاقاری ژینگە وتبووی بەس شەقەی باڵیان دەهات. یا کە ریقنەکەیان دەکرد هاواری لە کەسێک بەرز دەکردەوە. شاری قڕەجاڕ چ پیاوە ژندارەکانی، چ بێژنەکانی، کوڕو کاڵ، منداڵەنێرەکانی ناو سک، نێرە مووکەکان، تەنانەت وای لێ هاتبوو بڕێ لە ژنەکانیش

---

[1] خەوێ بۆ ۲۰۰۰ ساڵی داهاتوو: دایرەالمعارفەکەی داوێنچی لەبەر ئەم هۆیانە لە موزەی جیهانیدا هەڵگیرا. ۱ ـ هی کەسێکی ناودارە. ۲ـ ئاستی موتالای ئەم نیشاندەدا چونکە ئەوەندە خوێندراوەتەوە هیچی پێوە نەماوە.

ئەو شانازییە بخەنە سەر شان خۆیان بۆیە هەڵوێستیان گرت خۆیان بگۆڕن. بەڵام لەو دەم دەستەدا هیچ دۆکتۆرێ بەدەستەوە نەبوو. ئەو نەشتەرکارییە بکا. قرەجاریەک دوکتۆری لێمابوەوە. ئەویش مەتەبێکی کردبوەوەیەک لە زەوییەک لە ئاسمان. کاری ئەمە بوو رەحەتی بنیامەکانی زەویبنێرێ بۆئاسمان کە لەوێ بە دەرزی بیدەن لە هەورە نەبارەکان. هەر کە دوکتۆر ئەم مەتەبەی دانا. برێ دووکانی ناو شارکرانەوە. نامەیەک بۆرۆژنامە بەرێ کرا.[1] چی دەفرو دەبەو بیست لیتری و چوار لیتری و قوری و سەتڵ و ... بووکڕا. هەروایش زوو دووکانەکان داخرانەوە. کەس لەدەرەوە نەما. نە پیاوێک، نە ژنێک. بۆنی کەوچکە پیازداخیش بڕا. مناڵەکان لە کۆڵانەکان کەس نەبوو بە قاوقیژ پەلیان بگرێت و بە جنێو بیانکات بە ژووردا. شار هەر وا بێدەنگ. دوکتۆر لەپشت مێزەکەیدا تەمایەرە چاوی هەر لەدەرگا بوو بکرێتەوە. گوێ قولاخ بوو. ئای ڕەنگیێدەنگی. خەڵک هەرایان تێ کەوتەوە. بە پەلە

---

[1] سپاسی دوکتۆر کەژاوە دەکەین کە ١ ـ ئەم بەڵایەمان لەسەر لادەبات. ٢ ـ کاری خستەوە گڕ.
بەسپاسەوە: دووکاندارەکان

خۆیان گەیانە لای دوکتۆر. قوتوو، دلق، سەتلی چوارکیلۆیی‌و دەبە لەبەردەم دۆکتۆردا دانران، دوکتۆر حەپەسا.

- چیتان کردووە؟

بە هەناسەبڕکێ و نقەنق بیست لیترییەک، چوارلیترییەک و ئافتاوەیەک لەبەردەم دوکتۆردا تەقەی هات.

- ببوورن کەمیشە.

دوکتۆر خۆی نەشڵەژان. دەستێکی بەسەرو قژێدا هێنا.

- دەستتان خۆش بێ. ناوی خۆشتان نووسیوە؟ (چاوێکی لە شتەکان کرد) دوای لە وەڵامەکەی ئاگادارتان دەکەمەوە. (زۆر بە ئەدەبەوە وتی)

پیاوێک لەوسەری قڕەجارەوە بە خۆی و بۆشکەکەیەوە راوەستابوو. ژنەکەی ناردبوو بە دوای گاریدا. تەم و مژ نەیدەهێشت هیچکوێ تەنانەت نامووسەکەیشی چاو کات.

دۆکتۆر بە پەلە دەرگای پێوە دا. هەموویانی بردە حەمام. لەوانە کە دا رۆی کردن. تیتۆڵ تیتۆڵ جلەکانی لە بەر خۆی داکەند و چوو لە ناو رەحەتییەکاندا راکشا.

- درەنگە دەبێ ئەمە بگەیەنمە دوکتۆر. ئەو ژنە چی پێ هات؟

بۆشکەکەی پاڵ خست و دەستی بەپاڵ پێوەنانی کرد. بەردەمی خۆی نەدەدی دەترسا کەس بەری کەوێ.

- خەبەر. خەبەر. لاچن. لاچن، خەبەر.

بەخەبەر خەبەر گەیشتە بەر دەم ماڵی دوکتۆر کەژاوە. لە دەرکەی دا. وەڵامێکی نەبیست. دیسان، هیچ، دیسان، هیچ.

- رادەوەستم تاکوو دێتەوە.

جامانەکەی داخست. لەبەردەم بۆشکەکەیدا راکشا. کڵاوەکەی سەری نایە سەر لووتی.[1]

دۆکتۆر ئاگای لە دەرەوە نەبوو. لەوانەدا کەتەواو خووسابوو. دەستی لە خۆی دەخست، هەستا، دانیشت. لە رەحەتییەکەی مشت مشت کرد بە دەم و چاویدا. هیلاکی کەوتە لەشیەوە. هاتە دەر لە وانەکە.

---

[1] ئەم پیاوە مەحموودی زاروویان پێدەوت. هەموو پیاوەکانی خلەتاندبوو کە ئەگەر رەحەتییەکانی خۆیانی پێنەدەن کورپەکانیان دەکوژێ.

- بڵێی سپی بووبێتمەوە؟[1]

چووە بەر ئاوێنە،خۆی لەبەر ئاوێنەکەدا ئەمبارەو بار پێکرد.

- دەی هەتا کاردەکا پێی دەچێ.

بارانی حەمامەکەی بەردایەوە. چووە بەری. دەستی لە خۆی خست تا ئەوەی رەحەتییەکانی پێوە نەمێنێ.

بارانییەکە ئاوی پێدا نەهات. هەر وا خاولییەکەی لە خۆیەوە پێچا. تاقەتی سشواری نەبوو.چووە هاڵەکە تەلەفۆن دەنگی هات.

- تەهای دراوسێتانم. ئەوەی منتان نارد عەیب نەبێ؟

- دوا بە دوای ئێوە.

- ببوورە من ناوم نەنووسیوە دەتوانم بێم.

- داوای لێبوردنم هەیە. چونکە بەڕێمان کردووە.

- دوکتۆر بوو بە منداڵ؟

- کەژاوەخان پارەت دەدەمێ بەس ئەوەی من بنێری.

دوکتۆر کەژاوە سیمەکەی دەرهێنا. چووە سەر تەختەکەی. پاڵ کەوت. مەلافەکەی دا بە خۆیدا. هەر وا بە خاولییەکەوە خەوی لێکەوت. پۆتینیشی دیت.

---

[1] دوکتۆر حەزی چبووە پۆتینێکی خوێری. ئەویش مەرجی وەلامدانەوەی بە سپی بوونی ئەم دانابوو.

*خەڵک دوای ئەو رێگە نەجاتەی دوکتور لە بەردەمی دانان هیلاک هیلاک بوون بۆیە ئێستا کە هێشتا شار بارو دۆخەکەی شپرزە خەریکی خەون.*

*هەواڵنێری رۆژنامەی قرەجاڕ*

هاووڵاتییە خۆشەویستەکان.

نەخۆشی زیاتر دەبێ. زبڵەکان چارەسەر ناکرێن. تا ئێستاش نەزانراوە ئەم زبڵانە لە کوێوە هاتوون و دێن لە شاردا تا دێ زیاتر دەبێ. بۆیە ئێمە هاتینە سەر ئەو راییەی لە ئێوە داوا کەین وەسیەتنامە، نامە (یاخود هەرشتێکی دی) کانی خۆتان بنووسن، بڕیارە ئێمەقرەجاڕ لە بەروەی شارەکانیدیش نەگرێتەوە. ئاگرتێبەردەین. دوای داوای لێبوردن.

بەسپاسەوە: سکرتاریا

- دوکتۆر گزەی لێداوین.
- وەی کۆرپەکەم رۆ.

دوکتۆر دەرگای لەم دەنگە دەنگە نەکردەوە. مەحموودی زاروو لەو هەراو هوریایە خەبەری بوویەوە. بوشکە بە تاڵەکەی خۆی دیت. رەقی هەستا.

درگای دایه بەر شەق و لەقە. درگا شکا، خۆیان بە ژووردا کرد. دیو نەما کەس سێ چوارجار نەگەڕابێ.

- حەمام. (مەحمود وتی)

پەلاماری حەمام درا. مەحموودی زاروو خۆی درگای ئەویشی شکاند. هەموو لەبەر درگادا، بەتەمابوون هەموویانی دا بەعەرزدا. لەگەڵ خەستاوەکەدا شتێکی قورس هات بەسەریاندا رۆی. رووت و قووت. دەم و چاو ماسیوو. چاوەدەرپەڕییو. سک هەڵماسراو.

***

وڵامی نامەکەی سکرتاریا

گوڵزار.

بۆ سکرتاریای بەڕێز،

دوای سڵاو بۆ ئێوە، سەرۆکی بەڕێز. سکرتاریا.

من گەرەکمە لەبارەی باوکمەوە قسە بکەم.

باوکی میهرەبانی من لە ٤ ساڵانەییەوە نەمدییە. پۆلیسەکان بردیان، بە جۆرمی تفنگ گرتیان. بەڵام بەوخوا گیانە، بەگیانی باوکم هەر لە زۆر زووەوە تفەنگمان نەبووەو نایشمانبێ.دوای دوو مانگ و نۆ رۆژ

مەیتەکەیان بۆ هاوردینۆ. بەڵام، بۆ؟ نازانم. ئێستا من ١١ ساڵمەو چونکە غەمی بێباوکی دەخۆم ناتوانم جوان گوێچکە بەوانەکانم دەم. ئەوان دەیانوت: خۆی کوشتووە. بەڵام گشت گیانی رەش و شینۆ ببوو. ئێستاش بۆمان دەرنەکەوت کێ کوشتیەتی؟

***

بۆ هاوڕێی نزیکی خۆم بە ناوی داشەهارە (ئەبێ ناوەکەت سەیر بێ) لە هەسارەی زوحەل نامە دەنووسم.

هاوڕێی ئازیزم. هەواکەتان گەرمەیا سارد؟ زەریاتان هەیە؟ ئەی شاخ چی؟ شتی لێیە منداڵ لی بترسێ؟ راستی زوانتان چیە؟

تورکی

فارسی

عەرەبی

کوردی

کەبابی لێیە لای ئێوە؟ ئێرەش لێیەتی بۆکەی زۆر خۆشە.

ئەگەر وەڵامت بۆنووسیم ئەوەی پرسیارت هەیە بێشەرم بیکە. چونکە من خۆ وەڵامت نادەمەوە، ئاخر...

ئەگەر ئەی هاتوو هاتیشی بۆ زەوی ئەمە ناونیشانی ئێستاکەمە:

قڕەجاڕ، شەقامی (ناوەکەی نازانم) گەڕەکی (دەی تۆ کارت بە گەڕەکی ئێمە چییە) ببورە پلاکیشت بۆ نانووسم.

ناونیشانی داهاتوومت بۆدەنێرم.

پشکۆ

***

بۆ گەل،

بۆ خزمەتەکانم،

بۆ ئەو کۆرپەی بە هیوای بووم،

کە وەسیەتنامەکەمتان هەڵپچڕی من خۆم ئیعدام کردووە.

ئاواتم زۆر بوو. نەگەیشتم. قەینا بە زەلیلی نەمردم.

بەسپاسەوە: داوێنچی ۲ قڕەجاڕ پاش نیوەڕۆ

بۆ پۆتینێکی خوێڕی،

شایستەی سڵامیش نیت. شایستەی ئاراستەکردنی تۆڵەیت تۆخستمت بە دەستدا. نەمتدەویست. کەسێکت دەویست بەفر بێ. هەرچییەکیشت ویست زوانی لاڵ بێ. کڵفەتت ویست. ببورە، هیچکامیان نەبووم، هەرکات کە

دەکەویتەوە بیرم قیزم لێت هەڵدەوەشێتەوە. تا دواهەناسە لە بیری تۆڵتدام.

ئیمزا[1]

بەم نەخۆشیەش قەزات لە هەردوو چاوم.

بەرێز مەردانی

***

بۆ بەرێز مەردانی,

کە خوایەکی دەست کردم دروستکردایە. تۆم تەواو دەکرد

پەری

شەقام. کۆڵان، ناو حەوشەکان، چوار سووچی ماڵەکان، زبڵدانەکان و ... قرەجار ئاگریتێدا دەسووتێ. ئەوە بۆ سێزدە رۆژ دەچێ شار هەر لەو گڕەدا دەگڕێ بەلام بە پێی هەواڵی هەواڵنێری کەناڵەکەمان ئەم شارە ناسووتێ. بەس دەگڕێ. بۆنەکە بلاوترو بۆگەنتر بووە. زبڵەکان هەردێنوزیاد دەکەن. ئێستا ئێوە و هەواڵنێرەکەمان لە قرەجارِ:

---

[1] لە ناو میراتییەکانی دوکتور کەژاوەدا دۆزراەیەوە.

خۆشەویستان ئەم کاتەتان شاد. هاین بە سەر قڕەجاڕەوە. ئەم شارە بەو شێوەی کەدەزانن سووتێنراوە بە پێی بڕیاری سکرتاریا. گشت لایەک سەری سووڕ ماوە. ئەم شارەبە پێی ئەو هەمووە گڕە ناتوێتەوە، ناسووتێ، ئاگر زیاتر گڕە مەشغەڵانییەتی. ئەم ئاگرە خەریکە لە ناو شاریش دەترازێو ئەچێ بەرەو شارەدراوسێکانیش. سکرتاریا* لە پایتەخت زۆر لەم هەواڵەترسا. ماشینە ئاگرکوژێنەکانی نارد ئاگرەکە بکوژێننەوە. هەرچی ئاو دەکرا بە ئاگرەکەدا، ئاگرە هیچ نەدەکوژایەوە خۆی زیاتر بۆ لایان دەکێشا. بۆیەسەرۆکی ئاگرکوژێنەوە کە مرۆڤێکی زیرەک بوو دەست بەجێ فرمانی دا شار، لەئاسمانەوە بکوژرێتەوە. ئەوە بۆ چارەکێ دەچێ هەڵەکوفتێرەکان رژانەتە سەر ئاسمانی شار و ئاوەکانیان رۆ دەکەنە سەر شار.

هەواڵنێری تەلەڤزیۆنی پایتەخت

بینەرە بەڕێزەکان، بینەرە بەڕێزەکان ئەم هەواڵەمان هەر ئێستاکانە پێ گەیشت: ئاگرەکەی قڕەجار نەکوژایەوە، بەڵکوو زیاتر بووە. گوایە ئەو ئاوەیش کە

---

*سکرتاریا لەبەر زۆری وەسیەتنامەکان ئەوانیدی خستە پشت گوێ.

پێیدا دەکەن ئەویتەوە بە هەڵم و دێتەوە سەر قرەجاڕ
دەوەستێتەوە. شار لە ئاگردا هەر دەسووتێ. هەر.

# (ئەوەی حەزی لەبڵێندی نەبوو)

٢٧ ـ ١٣ نەجیب زایە بەرامبەر گوڵی شۆڕان. باوەش کراو بە قاچدا.*

- مێ پڵنگ ئاەەە چ تاریکەسەلاتێکە.

پڵنگی نێر نوقمی دووکەڵە جغارە.

٤-١٣ مێ پڵنگ دوومانگە تێنەکەوتووە.

١٣.١٦ لە چاخانەکە دانیشتووە.

- پڵنگی نێر ئەوە نەجیبزایە بانگت دەکا.

٢٢- ١٣ یەکەم مانگانەی وەرگرت توند لە گیرفانی نا. لەناو مشتیدا گووشی. پارەکە مچورکی خستە لەشیەوە.

---

*٢٧ - ١٣ ئەمن مێ پشیلە سۆزانییەکەم نەجیبزایە بانگ نەداوە بە گوێدا کاری پڵنگی نێرە.

- گوڵی شۆڕان ... گوڵی شۆڕان. چەپکێ نانا دوو چەپکەم (یەکێ بۆ نەجیبزایە ئەوی دی بۆ...) بۆ جیا بکەرەوە.

٩ - ١٣ ـ دیسان سۆزانییە هاتەوە.

ـ وێڵی کڕیارە.

٢ - ١٣ یەکەم شەرتی دادابوون: سیمای تایبەت بە خودی خۆت.

٢٨ - ١٣ ...

١ - ١٢ مێ پڵنگ و هەستێرە روانینەکانیان بۆیەکدی بەرێ کرد. هەستێرە دەستو قاچی شل بوو. ئەم قاچەکانو دەستەکانی زیاتر چەقاندبووە ئەرز.

(دوا هەستێرە. هەتا گڕابێ قاچەکانم سفتتر دەبن.)

(هەتا پڵنگی نێر بە گوڵی شۆڕانەوە. لەم داوێنی شاخە بەسەر نەکەوێتەوە من هەر لە لاتم.)

٢٣ - ١٣ فریا ناکەوێ سەرێ لە چاخانە دا. (وێڵکە لەو سەر کە هاتمەوە. سەرۆک خۆخوام نییە).

... ـ ١٣ چۆنت پێ بڵێم. نازانم. نازانم... .

هەندێ راوەستا، بە پڵتۆک سەرقۆڵەکەی تەکاند.

ـ نەجیبزایە دە بیڵێ. شتێک رووی داوە نەجیبزا؟

ـ نا... یانی ... بەڵێ.

دەستێکی بردو بە سکیدا هێنا. چاوەکانی بۆ داخست. خۆی تەنگ کردەوە.

ـ دەی.

هەر دوو دەستی هەڵێناو دەستەکانی ئەوی گرتە ئامێزی.

ـ شەقم برد دەی.

دەنگی خۆی ناسک کرد.

ـ پیاوەکە مانگ تەواو... دڵم بەیەکدا دێ.

ـ ... (حەپەسا)

٢٨-١٢. دادا: سەر هەڵدان. بە بانگو هاوارەوە بوون.

٢٥-١٣ دەستێکی کردە بە لەنگەرو سەری خستوەتە سەری. ژێر جغارەکەی بەردەمی لە سوتکە سەرریژە. دەنگە دەنگ، بلمە بلم، تێک هالاون. دووکەڵە جغارە لە ژوور سەری هەموویان گێنگڵ دەدا. دواجغارەی پاکەتە جغارەکەی داگیرساند. بەلێو مژێێکی لێدا. دووکەڵەکەی لە ناوەوە قووت دا. هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا. دووکەڵەجغارەکە بە کۆمەڵ خۆیان فڕێ دایە ژووری چاخانەکە. نایەوە بەدەمیەوە جغارەکە.

١ - ١٣ پڵنگی نێر لە بەروەی ئەم دێڕانە کەس بۆی نەچنرێتەوە چووە ریزی داداکانەوە.

٧ - ١٣

- چ مێ پشیلەیەکی نەجیبزایەیە.

دانیشت بەسەریەوە.

٢٤ - ١٣

- چۆنی پێ بڵێم چۆن؟

- چییە بۆ دەستەو دەست دەکەی.

مانگ بە تاقی ئاسمانەوە کاڵ ببووە. بەیەکجاری، تاریکە سەلات، تەقەی پێی دێ.

- من لە کوژانەوەدا نیم؟

- نا، بڕیارمان وا نەبوو.

(نا پێی ناڵێم، بەشکەم درۆ بێ. رەشەبا هەمیشە گیڤەی زۆرتر بە قسەو باسەکان دەدا.)

- ها ها ها (بە زۆر کەنی) هیچ هیچ بەخوا هیچ. تاقیم کردپەوە. ئەرێ دەی مێ پڵنگ. بەسە کەم چاو لە مانگ کە. حەوتخانە. گوڵی شۆڕان هەر وا مفت نییە.

بێدەنگ. چرکە. چرپە، هیچ، دنیا دەنگی لە خۆی چنیبوو.

٢٥ - ١٣... .

٢٦ - ١٣ - ئەمەیش لێکدانەوەی خەونەکانت.

نەجیبزایە هەستایە سەرپێ. پڵنگی نێر لە تەوقی سەرەوە تا پەنجەی پێی گڵێنەی لێ خشاند. چاوێکی بە سکیدا هێنا. دەستی بۆ برد.

- ها چاکیش قەڵەو بووی.

- (نەجیبزایە دەنگی خۆی تەنک کردەوە) لاوە بڕۆ قەڵەوی چی، بە سەر گوڵی شۆڕانەوە ماسیم.

- (چاوی لەسەر گوڵەکان بەست) ئەم چەپکەگوڵە شۆڕانە بۆ نەجیبزایە (چەپکەگەورەکەی دایێ).. ئەمەیشیان، ئەمەیشیان بۆ جەرگو دڵەکەی پڵنگی نێر....

چاوێکی دی لەسکی کرد

نەجیبزایەچەپکەکەی دیشی وەرگرت. بردی خستیە گوڵدانەکەی پشت تەختەکەیەوە. پڵنگی نێر لە پشتەوە چاوی لە ڕۆیشتنەکەی کرد. چاوی لە دەستی کرد کەگوڵەکەی ڕاسەو پاسەدەکرد لە گوڵدانەکەدا. ژێرجغارەیەک لە چاوی گیرا. دوو دانە جغارەی نیوە کێشراوی تێدابوو.

- نەجیبزایە !!!

- (بەپێکەنینەوە ئاوڕی دایەوە). گیان، (چاوە دەرپەڕاوەکانی دی سۆراخی دەرپەڕاوەکانی گرت لە

ژێر جغارەکە گیری کرد) ئێ... ئە... (زوو پەلاماری ژێرجغارەکەی دا).

- ئەوە چییە؟

- (رفاندی بۆ لای دڵقی زبڵەکە). هیچ ، هیچ نە بەو خودایە. هیچ. (رۆی کرد).

... - ١٢ گوڵی شۆڕان شایەنی مێ پڵنگ. حەوت کێو، حەوت دەریا. حەوت دەشت. حەوت بیابان. حەوت جەنگەڵ. حەوت حەیوانی دڕ. حەوت حۆری. هیچیان نامگەڕێننەوە لەوەی گوڵی شۆڕان بۆ مێ پڵنگی دڵخوازی خۆم بێنم. بۆ وەی پێی بڵێم حەوت رۆژی هەفتەیەک ساتی چییە لەیادی خۆمت ناخەم.

٢٦ - ١٣ دەرسێکی دی کە هەر دادایەک دەبێ پێڕەوی بکات: سەری بێدەلاک نەتاشینە. هەڵبەت ئەمە پڵنگی نێر دەبێ خۆی پێی بگات.

٣ - ١٣ پڵنگی نێر لێرەئیستعفانامەکەی خۆی نووسی. بەڵام، بەڵام قەت سەرۆکی داداکانی نەدی، واتا فریا نەدەکەوت ببینێ، نامەکەی تەسلیم بکات.

٨ - ١٣ چەند ساتێک بەرلەمەیەکەم بینین لە چاخانەکەدا رێ خرا. (بۆڵتنی هەواڵەکانی دادا).

١٤ ـ ١٣ مێ پڵنگ چەقڵێکی زەلام چەقیوەتە چاوی راستی. هەستا دەستێکی بۆ چاوی برد (خەو...)

١٩ ـ ١٣

– پڵنگی نێر نەجیبزایە بانگت دەکا.

ـ ئا چییە؟ چی بووە؟

نەجیبزایەپشتی تێکرد.

ـ زۆر نامەردی. کەتن دەکەی. پشت سەری خۆیشت چاو لێ ناکەی.

ـ بوو بە راست.

ـ ( توند ئاوڕێکی بۆ دەرکرد لە ئامێزی گرت) لەخەومدا منالێکمان بوو ناومان لێ نا، گوڵی شۆڕان.

ـ ... (داچڵەکا).

١٧ ـ ١٣ مێ پڵنگ چاوی بڕیوەتە مانگ. مانگ دەریایەکی مەنە. دەوری خەرمانە دەگەشێتەوە. ملی خستبۆوە سەر هەر دوو دەستەکانی.

ـ ... سیسرک ئەجریوێنێ.

کۆتر . گمم ... گمم م ، گم م ... .

١٣ ـ ١٣ ...[١]

---

[١] ١٣ ـ ١٣ ـ من نووسەری ئەم چیرۆکە (١٣ ـ ١٣) م بەجێ نەهێشتووە و فەرعیشم نەکردووەتەوە بۆی.

پڵنگی نێر مێ پشیله نەجیبزاکەی کردە باوەش. گەیاندی تا ماڵەکەی خۆی.

١٢ ـ ١٣ هەڵم پەنجەرەکانی خنیبوو. هەموو جێ پەنجە بوو. ئەمە دابی دادایە. پەنجە. لەو جێ پەنجانەوە گشت ئەوانەی ناو چاخانەکە ملیان حەوا دابوو.

٧ ـ ١٣ بینین لەم قاوەخانەدایەو بەس (ئەندامێکی کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی.)

١٠ ـ ١٣ مێ پشیلەیەکی سۆزانی نەورۆییەتی. پڵنگی نێر بەسەر سەریەوە وەستاوە.

١٨ ـ ١٣ سێهەم شەرتی دادا:

١ ـ وەفا درووست.

٢ ـ مەرام درووست.

٣ ـ قەول درووست.

٩٩ ـ ١٢ پڵنگێکی نێر هاتۆتە ناو ریزی قارەمانەکانی داداوە. لە شاخ دابەزیوە. ئێمە وەک سەرۆکی ئەم گرووپە، بە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین کە: ئەوەی شیاوی قارەمانی نازداری دادایە وای رایهێنین.

٢١ ـ ١٣ ئاهەنگی «سیلین دیۆن» دەخوێنێ. ئەو شریتەی وا بۆ تایتانیکی چڕیبوو. پەردەکان دادراوە. تاریکی بەخشراوە بە ژوورەکە. شەوخەفێک دەگرێ.

دەورو بەری خۆی سوور کردووە. پڵنگی نێر بە پێی بانگ هێشتنی زووتر هات. دەرکەی داخست. نەجیبزایەی لە تەختەکەدا راکشاو دیت. هیچی بە خۆیدا نەدابوو. چاوەکانی سەریەکنابوو. پڵنگی نێر بە ئەسپایی مەلافەکەی هەڵگرت. پیایدا. خۆیشی چووە بنی و لاکەی دی مەلافەکەی بەسەر خۆیدا کیشا. شەوخەف مەلافەکەی سوور کرد.[1]

هاتمەوە پێی ...

هاتمەوە بە هاوسەرەکەم بڵێم: ئەمرۆیش هەر سەر رێگەی پێ گرتم. من راوەستابووم بۆ ماشین. لەوەتی من دەچم بۆ کلاس لە سەر رێگەکەمدا دووکانی شتی خواردەمەنی داناوە. قەتم کڕیار لێ نەدیوە. هەرکە رادەوەستم دووکانەکەی دەداتە دەست دراوسێ دووکانەکەی و لەگەڵم رادەوەستێ بۆ ماشین. سەرەتاکان هیچی نەئەوت، ئیشارە و شتیش هیچ. بەس ئەگەر ماشینێک هات سەیری ماشینەکە دەکات تا

---

[1] سەرنج:

چونکە ئەم چیرۆکە دەستکاری کراوەو ئەمەیش ئەمن کاتێ کە چاپ کرا بینیومە. بۆیە دەڵێم: نووسەری ئەمە (پەری کەریمینیا) نییە. ... .

دەگاتە لای من. ماشینە ویڵ دەکا و بڕێ لە من رادەمێنێ. ئێستا سەر و سمێڵیشی پاک پاک دەتاشێ. ئودکۆلۆنێ لە خۆی دەدا لەوەی کە تۆبە جێی ئودکۆلۆنەکەی من کڕیت. من وتم: «سانتیاگۆ» و تۆ «وانمانشۆ»ت هێنایەوە.

دەسەسرێکی سپی خاوێن خاوێنیشی پێیە دەیهێنێ بە سەر و ملیدا و دەڵێ گەرما!؟ گەرما!؟. دوگمەی پاڵتۆکەی دەکاتەوە.

لە درگام دا هاوسەرەکەم درگام بۆ بکاتەوە و بۆی بگێڕمەوە کە ئەمڕۆ رووداوتر بووە و هاتوویشەتە ناو ماشینەکەم و لە بەریشەوە دانیشتووە بە جێی منیش کرێکەی داوە. ویستم نەهێڵم ئەو ئاوڕی دایەوە و وتی: دەبێ ببیتە هاوسەرم. ویستم بڵێم: ببوورە برای بەڕێز نانت لە جێگایەکیدی بدرێتێ، کە شۆفیرِ وتی: خواحافیز. ئەو پێش لە من دابەزی و لە بەردەم درگای کلاسەکەمدا راوەستا. بە شۆفیرم وت: دانابەزم.

ئەرێ پێت بڵێم: من ئیتر ناچمەوە بۆ کلاس. پێت بڵێم ئەمەیشی پێداوم. زنجیر و ئەڵڵایەک. من یەکەمجار نەمدیت، لە سەرباوشم بوو. بە قینەوە چاوم لێکرد. پێدەکەنی. دەسەسرە سپیەکەی دەهێنا بە ملیدا.

شۆفیرەکەیەک چرکەیش ڕانەدەوەستا. ئەگەر ماشینە ریز کراوەکان لە پشت چرای سووردا نەبوایە. هەر ئاوڕم نەدایەوە. دەستم لە سەر ئەڵڵا و زنجیرەکە قوفڵ کردبوو. لەرزینەکە نەدەبڕا. لە ماشینەکە دابەزیم و ملی ڕێگام گرت. دەنگێکم بیست: ئەڵڵا بە زنجیرەوە.

بە پەلە هاتمەوە پێت بڵێم: بە دوامەوەیە. دەستی لە ناو هەر دوو گیرفانی پاڵتۆ ڕەشەکەی ناوە. قاچی لە ناو جێ پێڵاوەکانم دادەنێ.

وتم کە دەرکەت کردەوە و ئاوا بە لەرز بینیمت باوشت پێدا کردم وتت: چی بووە؟ پێت بڵێم: هەڕەشەی لێکردووم جەزام لێ بستێنێت. هاتمەوە پێت بڵێم: تەلەفوونەکە لا ببە. نامەوێ ژمارەکەمان بزانێت. هاتمەوە پێت بڵێم: ئەزانی من لە پیاوی بێ سمێڵی پاڵتۆ ڕەش دەترسم. ئیتر لەو شەقام و کۆڵانەیشەوە ناڕۆم.

هاتمەوە پێت بڵێم:

چاوێکی لە هاوسەرەکەی کرد و ڕوانییە مێزەکەی بەرامبەری.

- بەڵێ جەنابی قازی، هاتمەوە پێی بڵێم.

# گڕا

(١)

جگەرەی قشقەڕەی لە پاکەتەکە دەرهێنا. نەیقڕاند. شەمچەکەی لە پاکەتەکە دەرهێنا . قشقەڕە نەیقڕاند. شقارتەکە خوی خشاند بە پشت خۆیدا؟ قشقەڕەە قڕاندی.

(٢)

من قشقەڕەم . خۆشەویستم.

# من...تۆ...

(١)

هەموو لە پاڵیەکدیدا بوون و هومووی‌شیان خۆیان بە دیکتاتۆر نەدەزانی و هەمووشیان پێیان وابوو ئەوی دی لەم دیکتاتۆرترە و خۆی لە پای ئەم بە دیمۆکراتتر دەۆانی.

لەو ئان و ساتەدل دیمۆکراتترەکان لە ناو خۆیان دا دیکتاتۆرترین کەسیان هەڵبژارد. لە تەواوی کاناڵیT.Vیەکان پیشانییان دا و دۆکتۆرێکیشیان کردە پاڵی تا بزانێ ئەم دیکتاتۆرترین کەسە دەمارێ لە شێتی لە لەشی دایەیا ئەوەی کە...؟

هەموویان لەو ئان و ساتەدا کە دۆکتۆر لە گەڵ دیکتاتۆرترین کەسە کە خەریکی گێرە و کێشە بوو لە وتووویژێکی گەرم دا بوون و تەواوی کاناڵیT.V وڵاتان ئەم کۆبوونەوەیان بە کۆبوونەوەیەکی حەیاتی و کارتێکەر ناوزەد کرد. گوایە خەریکی راوێژ لە سەر ئەم ماڤانەن کە داویانە بە هەموو کەسێک و دوای

کوژاندنەوەیT.Vیەکان هەموو کەسەکان بە خۆیان ئەوەت: "بەڵێ. بەڵێ."

لەو بەڵێ بەڵێ دا دەرگای ژوورەکەی دۆکتور و دیکتاتورترین کەس کرایەوە.

- بەڵێ... بەڵێ.

(٢)

هەموویان لە پاڵیەکدی دا بوون. هەموویشیان خۆیان بە دیمۆکراتترین کەس نەدەزانی.هەموویشیان پێیان وابوو ئەوی دی لەم دیمۆکراتترە. خۆی لە پای ئەو بە دیکتاتۆرتر دەۆانی. لەو ئان و ساتە دا دیکتاتۆرترین کەسەکان لە ناو خۆیان دا دیمۆکراتترینیان هەڵبژراد. لە بەر تەواوی کاناڵەکانیT.Vیەکان پیشانییان دا. دۆکتۆرێکیشیان کردە پاڵی. تاکوو بزانێ ئەم دیمۆکراتترین کەسە دەمارێ لە شێتی لە لەشی دا لێدەدا. یا ئەوەی کە...؟

هەموویان لەو ئان و ساتە دا کە دۆکتۆر لە گەڵ دیمۆکراتترین کەس خەریکی گێرە و کێشە بوو. لە وتووویژێکی گەرم دا بوون. تەواوی کاناڵەکانیT.V وڵاتان ئەم کۆبوونەوەیان بە کۆبوونەوەیەکی کارتێکەر

و حەیاتی ناو لێ برد. گوایە خەریکی راویژ لە مەڕ زۆڵمەکانییان بەرامبەر بە هەموو کەسێک.

دوای کووژانەوەیT.Vیەکان هەموو کەسەکان بە خۆیان ئەوت:

-نا...نا.

لەو نا...نا دا دەرگای ژوورەکەی دۆکتۆر و دیمۆکراتترین کەس کرایەوە.

-نا... نا....

(باوکە پێی وتم:...)

باوکە دەڵێ خۆشتم دەوێی و من قاقا پێ دەکەنم و دەڵێم باوک کچی خۆی خۆش نەوێ ئەی کێی خۆش بوێ؟ وتی ئەگەر لە سەفەر بێمەوە کچی باوکی خۆی چیت بۆ بێنم وتم چیت پێ جوان بوو من پیمجوانە. وام هەست کرد چاوی بڕییە شوێنێک و وتی: من بەس تۆم پێ جوانە .دەنگم بەرز کردەوە و وتم:باوکە ئەوە خۆ نابێتە هەدیە من هەدیەم دەوێت من هەدیەم دەوێت. لە سەرەخۆ وتی: باشە باشە توورە مەبە دەچمە بازار چیم پێ جوان بوو بۆتی دێنم. وتی راستی ئەی ئەوەی خۆشتم دەوێ شەراب دەخۆی بۆت بێنم شەرابی

فەرەنسە شرابە لە کیست دەچێت؟ لچم هەڵقوورتاند و چاوم تووند تووند گووشی وتی: باشە باشە حەتم دەڵێت لای خۆمان هەیە. هەر ئێستا کە قسە کردنەکەمان تەواو بوو دەچمە سوپێرمارکێتەکە و قسەم پێ بڕی: باوکە باوکە کۆترێک هاتە سەر گوێسەبانەکە باوکە باوکە کۆترە... باریکەیە ئاخێکی هەڵکێشا: بریا ئەو کۆترە من دەبوم لە سەر گویسەبانی ژوورەکەت دا دەنیشتمەوە وتم: باوکە هێواش هێواش هەر کەس بیبیسێت لێرە دەنیشیتەوە گوێم هەلدەقەنێت. وتی :من ناوم هەیە خۆزگە تۆ جارێک بە ناویخۆم بانگت دەکردم تاکەی ئەم ڕۆڵە دەگێری . هیچم نەوت. ویستم بڵێم:... هەر چییەکم کرد ناوی نەهاتە سەر زمانم دەتکوت ناویم لە بیر چووەتەوە و یا هەر لە بنەڕەتدا ناوی نەبوو. ڕاستی باوکە بە چی بانگیان دەکرد؟ نانا ئەو هەر ناوی باوکە بوو پێم وت:باوکە دەزانی من دەزگیرانێکم بوو هەر بە کۆتر بانگی دەکردم. دەنگی هەڵبڕی هات بڵێ: نەم هێشت هیچ بڵێ وتم: باوکە تۆ لەم من دڵ پیسی ئەم جار مات نەبوو وتی: دەنکە هەنار ئەو شەو لە خەوم دا گونات نووساندبوو بە گۆنامەوە هەڵمدایە: نەکا باوکە ماچیشت کردبێتم وتی: ئۆف بریا ماچم نەدەکردی بە

قاقاوه وتم:نەکا باوکه بڵێی ماچ لێکمان دوور دەخاتەوه . چاو ترووکاند و وتی: وێڵکه راستی لەو دوا وێنەوه که دیومه هیچ گۆڕاویت چاوت هەر وا که له وێنەکه دا دیارەماڵ و مینەکەم تەڕه وتم باوکه بەخوا نەگریاوم وتی: دنیاکەم وتم رەنگه بۆ من دڵت تەنگ بووبێت و گریا بیت وتم: من و دڵتەنگی؟ هەموو شەوێک قسەت له گەڵ دەکەم دەنگت دەبیسم هەناسەکانت دی به روومدا بەس چاوت نابینم که ئەویش که هاتیتەوه چاوت له گەڵ خۆت بێنەوه نەیهێشت قسەکەم بکەم: خۆشەویستم لێره که دەچمه دەروه هەموو رۆژێک دەتبینم چاوه قاوەوییه تەڕەکەت ها له ناو چاوی ئەو کچەی وا دەچم شەرابی لێ دەکڕم بڕوا بکه دەنکه هەنار دەمه نوقڵییەکەیشت رۆژێک له ناو دەمی کوڕێکی رەشدا بینم خۆم هەڵگووشی و به خێرایی بەلایان دا تێپەڕیم و هەر سەیرم نەکردنەوه :وتم: باوکه ئەها دڵت پیسه. دەنگی زۆر هەڵبڕی قەت وا نەبوو: من دڵم پیس نییه نامهەوێ خوو بگرم به نەدیتن و به نەبیستن من خۆم لانادەم له خۆشەویستیت . له هەموو دونیات دەستێنمەوه.

پێم بڕی: ده باوکه تۆش جارێک بڵێ :کچم وتی: ئاخ: زوو وتم چی بوو: وتی لێو خۆم زۆر به توندی گەست خۆشەویستم. وتم: منیش له داخا ئێتر پێت ناڵێم باوکه

تۆ باوکێکی خراپی خراپی خراپی باوکە. دەنگی پێکەنینی وای کرد گوێم هەندێک بکشێنمەوە: خۆ وتت نالێم باوکە ئەی بۆ وتت. دەمووچاوم سوور هەلگرا گەرمییەک هاتە لێومەوە تەقەتەقێک چاومی برد بۆ لای پەنجەرەکە:باوکە باوکە باران خۆی دەساوێت لە پەنجەرەکەم باوکە باوکە باران بانگم دەکات خۆمی بەر دەم. بە ئەسپایی دەنگی دەرهات: بۆنی بارانی پەنجەرەکەت بکە رەهایی خۆم و خۆت وتم : باوکە رەها ناوی کێیە وا لە دەمت ترازا: وتی دەنکە هەنار کەم خۆت گێل بکە دەزانم چاک دەزانی چی دەلێم چاک دەزانی لێرەوە لەم قوولاییی دنیاوە لەم شارەی کە بەفر بەردەوام تیددەهالێتباسی چی دەکەم تۆنی دەنگم هەندێ گۆڕاند: با باسی ئەوە نەکەین ناتوانم بەو شێوەی کە دەلێی بتشوبهێنم. پەنجەرەکە لە پڕ کرایەوە باران هاتە سەر شانم چووم بە پەلە پەنجەرەکەم پێوەدا دا سەیری گریانی ئاسمانم کرد: فیلەکانیش هەندێک جار دەگرین بیرم کەوتە کە ئەو جارە وای وت وتم من پێم خوش نییە فیل بم من بەچکە فیلم وتی: ئەوە گریانی منە شانتی خووساند. سەر شانم نەسڕی با ئەو گریانە بە رەهایی بە سەر شان و ملم دا داخوڕێت: گوێم لە ناوی خۆم بوو: وتم بەلێ وتی: بە

## و...

خ...و...ا... حەزی لیٚ نییە بیر لەوە بکاتەوە کە سەرەتا خواییەک هات یا سەرەتا خ...و...ا. دەستی لە سەیر کردنی هەستیٚرەکان هەڵگرت. ئەو لەو ئاسمانەدا هەستیٚرەکەی خۆی بۆ نەدۆزرایەوە. رەنگە چونکە نەیزانی خوا لە چ سووچیٚکی ئەو کاکیٚشانە دابنیٚ. هیچ کویٚ بۆ ئەوە نەدەبوو خوای لیٚ راگیر بکات، بۆیە هیٚنای بە ماتیکەکەی دای لە سەر لیٚوی. سەرەتاییترین شویٚنیٚک کە ئەتوانیٚ جیٚی چیٚژ بیٚت. دەم و لیٚویٚکی بچکۆلە. ماتیکیٚک بۆیەک ساڵی بەس بوو. قەت ماتیکەکەی نەدەخوارد . هەمیشە لای کەسانیتر بەوەوە خۆی بادەدا کە ئەو ماتیکەکەیناخوات. ئەو ئەیزانیناتوانیٚ خوا بۆ ناو گەدەی قوت بدات بۆیە کە دەهاتەوە بۆ ماڵەوە دەست بە جیٚ خۆی لە ئاویٚنەکەدا دەبینییەوە. ئاویٚنەکە توند توند دەستی بە لیٚوی دا

دەهێنا و ماتیکەکەی کاڵ دەکردەوە. خوا ئێستا لە سەر ئاوێنەکە پڕە.

# ماچی ئەم جارەیان بۆ تۆیە

ئێستا حەزم لێیە بچم بنووسم بە هەر دوو گۆنا سوورەکەیدا و هەتا دڵ دەخوازێت ماچی بکەم ئەو دێت و دەمم دەگەڕێنێتەوە و دەڵێت: گۆنای من خۆ سوورترە. من حەزم لێیە لە گەڵ ماچەکەیدا تێر تێر بۆنی هەڵمژم و خۆزگە تەنیاییەکانی غوربەتمی پێ تێراوکەم. ئەو دەست بە جێ لە حەمام دێتە دەرێ: بۆن هەر بۆنە. چرنۆکێک لە دڵم دەگیردرێت. من پێم وایە هەموو ماچێک بۆنی خۆی لە گەڵە. هەندێ ماچ بۆنی ئۆدکۆلۆن، هەندێکیان بۆنی بەهەشت و بڕێکیشیان کە بۆنی لە بۆنی هیچ کەسی دی ناچێت وەک ماسیەکی لینج وایە بۆنی ساردی لێوە دێت. دەمەوێ بچم ساردییەک بنێم بە سەرمەوە. ساردی رەش. بەهێزترین خەمڕەوێنی هەناوم. شیرمۆزەکە دەنێت بە لێومەوە. زیاتر گەرم دادێم. دەمەوێ بچم باوەش بکەم بەودا و لە ناو کراسە ئاوییە ئاسمانییەکەیدا خۆم ون کەم. دێ

باوەشم پێدا دەکات و توند و توند دەمگووشێ بە خۆیەوە و دەڵێت ئۆخخەیی. ناهێڵم ئۆخەکەی تەواو بێت بیرم ئەگوازمەوە بۆ لای ئەو. ئەو چیرۆکی ژیانی خۆیم بۆ دەگێڕێتەوە:دایکم نەیئەهێشت بۆ کاتێ سەرینی ماندوویی لە ژوور سەر نێم. دەیناردم بە دوای باوکمدا. بە دزییەوە بزانم باوکم دەچێت بۆ لای فریشتە . ئەم دەڵێت: کە بیر لە تۆ دەکەمەوە هەست دەکەم زەوی تازە خەریکە خۆی دەگرێت. شل و شەوێڵ. تەم و مژ دنیای داگرتووە. دارەکان وەکوو چووزوو وان . تازە سەر دەردێنن. ئای پەری کە بیر لە تۆ دەکەمەوە...

حەزم بۆ بیستنی ئەم قسانە ناچێت. ئەو کە قسەم بۆ دەگێڕێتەوە کە دووبارە و سەدبارەیش بێت هەر خۆشە. ئەو هەر جارەو لە سووچێکی قسەکەوە دەست پێ دەکا: فریشتە کچێکی رەش تاڵەیخاڵاوی بوو. ئەم دەڵێ: خاڵاوی کوێی جوانە. دەموو چاوی پان نەبێت وەکوو نێو چاوانی دەریا. ساف نەبێت وەکوو دڵ جوانی لە کوێی دایە. دەمووروو رادەکشێم. خۆم گرمۆڵە بکەم: چییە حەزت لێیە بچیتەوە ناو سکی دایکت. ئەم دێ و زوو لە پاڵم دا رادەکشێت و هەر دوو قاچی جوت دەکات لێم. من هەر گرمۆڵەم. ئەو خۆییم لێدەخا...

ئەها دایکە ئەمجارەیشیان نەیانهێشت تێر تێر ماچت بکەم.

